# یادەوەرییەکانی لاوێکی هەڵەبجەی کیمیابارانکراو

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

سەدرەدین محێدین کەڵوڕیی

چاپی دووەم
2022

# یادەوەرییەکانی
# لاوێکی هەڵەبجەی کیمیابارانکراو

ڕۆمان

کیمیاباران چەندین چاوی گەشی پووکاند، بەڵام نەیتوانی چاوی دڵی ئاشقان بپووکێنێ، بەڵکو گڕی ئیشقی بە تینتر و گەشاوەتر کرد.

سەدرەدین محێدین کەڵوڕیی

چاپی یەکەم
٢٠٢٢

مافی له چاپدان و لەبەر گرتنەوەی بۆ نووسەر پارێزراوە


ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : یادەوەرییەکانی لاوێکی هەڵەبجەی کیمیابارانکراو **

بابـــــــەت: ڕۆمان

نوسیـــــنی: سەدرەدین محێدین کەلۆریی

شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج

نۆبەتی چاپ : چاپی یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٢٢

نرخ(٥٠٠٠)دینار

لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن(١٣٦٣)ی ساڵی ٢٠٢٢ی پێدراوە.

## (١)

تەلاری بەرز، جۆرین پارکی پڕ لە گوڵ و گوڵزاری قەشەنگ، پارکی تایبەت بە شاری یاری، پاکوخاوێنی شەقامەکان، ئەو شارەی ڕازاند بووەوە، ڕازاوەتر دیاربوو، بەو دەریایەی بە لایدا تێپەڕدەبوو تەی دەکرد، بەڵام ئەو شارە وەك شارەکانی دیکەی کەناری دەریا نەبوو، بە شاری پیرۆز ناوبانگی دەرکردبوو، پیرۆزی لە چییدا؟ لە بەردێك!! بەردێك سێ مەتر بەرزی دەبوو، بنکەکەیشی سێ مەتر دەبوو، تا بەرەو سەرەوە دەچوو کەمتر دەبووەو شێوەیەکی هەرەمی پێ بەخشیبوو، وێڕای ئەوەی بە بەرد ناوی دەهێنرا، بەڵام تاوێرێ بو، ئەو بەردەی شەوانە لەگەڵ هاتنی دوو دۆڵفینـدا کەناری دەریای ڕووناك دەکردەوە، بەردێکی زۆر سەیرو سەمەرە، ناوبانگی ئەو شارە بەو بەردەوە بوو، هەمیشە خەڵکی دەیانگوت( ئەو بەردە پاشماوەی چیای بەفرینی نێو دەریایە، سەردەمانێك لە ناوەڕاستی دەریا بووە، وردە وردە ئاوی دەریاکە کەمی کردووە، تا بەردی پیرۆز دەرکەوتووە.ئەوەی جێسەرنجی ئەو شارە بوو، هەر بە دەرکەوتنی دوو دۆڵفینی زۆر جیاواز لە دۆڵفینەکانی دیکەی دەریا، زۆر سپی، سپییەك هێندەی بەفر سپی، پێدەچوو چۆن بەردی پیرۆز پاشماوەی چیایەکی

بەفرینی بەرزی نێو دەریایە، دوو دۆلفینەکە بێچووی ئەو چیایە بن، مانگی جارێدووان دەردەکەوتن، هەموو جارەکان لە شەواندا دەبوو، بە دەرکەوتنیان، بەردی پیرۆز، بەردی سپی، یەك پارچە وەك ئەلماسی لێدەهات، بە ڕەونەقی وبە شەوقێك دەدرەوشایەوە، دەڤەری کەناری دەریای دەکردە چراخان، سەرنجی هەموو خەلکی ڕادەکێشا، لەو کاتانە، بە قسەی خەلکی ئەو شارە، دەتتوانی چیی هیواو ئاواتت هەیە لەوبەردە داوای بکەی بێنێتە دی، هەر بۆیە بەبەردی پیرۆز ناوی دەرکردبوو، زیاتر ناوەکەی خۆی پاراست وخەلکی دوو دلّو گالّتە جاڕیکەر بە بەردەکە وئەوانەی باوڕیان پێینەبوو، ناچاریکردن باوەڕیان پێیبێت، ئەو ڕۆژەبوو، مافیاکانی تووشی سەرسوڕمان کردبوو، کاتێ دەیانویست پارچە پارچەی بکەن وبە نرخێکی خەیالّی هاوتای نرخی مرواری بیفرۆشن، بەلاّم لەگەلّ یەکەمین وەشاندنی چاکوش بۆ پارچەکردنی ولەگەلّ بەرزکردنەوەی چەکوشەکە بۆ لێدانی نەیهێشت بیهێنێتە خوارەوە، لە تەنیشتی خۆیەوە کردیە پەیکەرێك، ئەو پەیکەرە ڕەشەی تا ئەوڕۆش جێسەرنجی خەلکییە، کەسوکاری زۆر ویستیان بە هەر ڕێیەکە کوڕی بە پەیکەربوویان لەو شوێنە ڕزگاربکەن، بەلاّم هەموو هەولّدانیان پووچ دەبووەوە چونکە لە هەر نزیکبوونەوەیەکیان، ژانە سکێکی بێهاوتایان تووش دەبوو، ژانە سکێك دوو ڕۆژ پێی دەتلانەوە وهیچ پزیشکێکی ئەو شارە بۆی چارەسەر نەدەبوو، مافیاکان ترسان زیاتریش تۆقین وڕایانکرد کاتێ گوێیان لە

هـاواری دوو دۆڵفینــە سـپییەکە بـوو، لـە دوورەوە بـۆ پاراسـتنی بەردی پیرۆز بە تاو دەهاتن، چەندین ساڵبوو ئەو بەردە هـەر لـەوێ بـوو، خـۆی دەپاراسـت.لـەو شـارەدا، لـە خانوویـەکی خنجیلـە لەگـەڵ(زەردە) ژیـانی بەسـەردەبرد. ئـەو شـارە کەشـوهەوایەکی فێنکوخـۆش ودڵـڕفێنی هـەبوو، نـاوی بـە خۆیـەوە بـوو، چـونکە شارێکی ئەوروپی بوو.گـەر زەردە نەبوایـە، نەیدەتوانی بـە ویسـتی خۆی بۆ بازێر و پارکەکانی نێو ئەو شارە بچێت.هەر لـەو ڕۆژەوەی چووە ئـەو وڵاتـە و پەناهانـدەییان پێـدا، دوور لـە باوەشـی گـەرمی نیشتیمان، لەو شارە جێنشین کرا، جگە لـەو نەشـتەرگەرییانەی بـۆ چاکبوونەوەی چاوەکانی دەکرا، مانگانـە پشـکنینی تایبـەتیان بـۆ چـاوەکانی دەکـرد.ئەنـدامی کۆمەڵـەی نابینایـانی ئـەو شـارە بـوو، کۆلێـژی تایبـەت بـە نابینایـانی لـەو وڵاتـە تـەواو کـرد، بـە نمـرەی نایـاب دەرچـوو.زەردە ئـەو سـەگە بـەوەفا و تایبەتـە بـوو کۆمەڵـەی نابینایـان پێیـان بەخشـیبوو، دەرچـووی خـولێ تایبـەت بـوو بـۆ چۆنیەتی هاوکاریکردنی نابینایان، مووچەیەکی تایبەتی بـۆ خـۆی و زەردە تـەرخانکرابوو، جگـە لـە زەردە ڕاهێنـەرێکی تایبـەت بـە نابینایان یەك مانگ فێری چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردنی کرد لـە نێـو ئـەو خـانووە خنجیلـە تایبەتـەی پێیـان دابـوو، ڕاهێنـان لەسـەر ئاشنایی تەواوی ئـەو و زەردە بـۆ پێکـەوەژیان وچـوونە نێـو بـازێر، پارکـەکان وکـەناری دەریـا، پاشـان جێیهێشـتن. هـەر لـە کۆمەڵـەی نابینایان خولێکی میوزیکیان بۆ کردنەوە، بووە عودژەن ، زۆربـەی

گۆرانییە خۆماڵی وفۆلکلۆرییەکان فێر ببوو، زۆرترین کاتی بە ژەنینی عودەکەی بەسەر دەبرد، خۆی وزەردە وعودەکەی سێ هاوڕێی هەمیشەیی یەکدی بوون، لەگەڵ زەردە هێند هۆگری یەکدی بوون، خۆشەویستییەکی بێئەندازە لە نێویان پەرەی سەندبوو، تا ئەو ڕادەیەی کە گێژاوی خەیاڵ بۆ خۆی ڕاپێچی دەکرد، زەردە هەستی پێدەکرد وا دڵتەنگی و ناموێیی خەریکە ڕووی دادەپۆشن، هەر بۆیە لەو ساتانە خۆی دەهاوێشتە ئامێزی وبە لمۆزی یاری لەگەڵ دەکرد، تا ناخۆشییەکانی بیر بەرێتەوە، یان عودەکەی پێدەگەیاند، خۆیشی بەرانبەری قنجی دەدایەوە و گوێی لە ئاوازەکان دەگرت، ئەو ئاوازانە بە نێو چیا ودار ودارستان، نێو باخ وجێژوانی لەگەڵ دڵخوازەکەی، وەك مەلێك هەڵیان دەفڕاند، خۆی وەك (کەوی کوێستانی نێو چیاکان لە زستان دەبینییەوە، ئەم لووتکە بۆ ئەو لوتکەی دەکرد، لە بەهاران وەك لەقلەقێ لە بەرزترین ترۆپکی داری دارستانەکان دەبینییەوە بە ویستی خۆی بە سەرشارا هەڵدەفڕی، هێمن وئارام، چاوی بە کوچەو کۆلانەکانی شاردا دەخشاند، یا وەك بولبولێ لەگەڵ دڵخوازەکەی لەم چڵ دار بۆ ئەو چڵی داری باخەکان هەڵدەفڕین وبارییان دەکرد، گۆرانی خۆشیان دەچڕی، خۆی لە شەوێکی هاویندا دەبینییەوە وەك بازێك دەچووە بەرزترین لوتکەی شاخەکانی دەوروبەری شار، تێر تەماشای مانگو ئەستێرەکانی ئاسمانی شارەکەی دەکرد، ئەمجارەیان(خۆی بینییەوە وەك

بولبولێك، زەردی بنباڵ سەوز، بەرانبەر بولبولە دڵخوازەکەی سپی بنباڵ سوور، بۆی دەخوێند تا دەیتوانی بە ئازادی دەیچریکاند، ئەویش بە نەغمەیەکی ناسکوجوان وەڵامی دەدایەوە، جۆش وخرۆشییان دابووە ئەو دەڤەرە، درەختەکان هاتبوونە سەما، چرۆکان دەمیان کردبۆوە وبۆنی خۆشیان بە هەناسەی گەرم وخوێنی گەرمی ئیشقایەتییان دەپرژان، خورەی ئاوی نێو جۆگەلەی باخەکان، هاوبەشبوون لەو ئاوازانە، تیپی میوزیکی ئەو کەشە ڕۆمانسییە بوون، لە پڕێکا ڕاوچییەك، ڕۆمانسییەتی لێدزین ولە قەفەزی نان، ڕاوچیی ستەمکار بەوەشەوە نەوەستا چاویانی توند بە پەڕۆیەکی ڕەش بەست، لە جوانی (دیمەنی باخ، شار، شاخ، چاتۆڵی ئاسمانی شین)ی سەرشاری کردن ونەغمەی خۆشیی لە سینگا بەندکردن.عودەکەی بە تەواوی تەڕدەبوو، ئەشکی تنۆك تنۆك وەك ئاورینگ بە تاڵ تاڵی عودەکە قەتیس دەماو، ئاوازەکەی سۆزتر دەردەچوان، لەو کاتانە، سەگی بەوەفا بە زمانی سەرچۆکی دەلێستەوە تا دڵی هێوربکاتەوە. زۆرجار لەبەر خۆیەوە دەیگوت.....

( گەر ئەم عودە نەبوایە کێ لەم وڵاتی غەریبییە دڵی دەدامەوە، کێ ئاوازی گەرمیان وکوێستانی بۆ دەچڕیم...کێ بۆی دەچڕیم!).

بە ئاواتەوە، بۆ حەڤدە ساڵ دەچوو لەو وڵاتە ژیانی بەسەر دەبرد، تا بتوانێ بە چاوێکی ساغەوە بگەڕێتەوە نیشتیمان، نێو باخی هەڵقرچاو، نێو کەس وخۆشەویستانی. دەڵێ "کوێر تا مردن بە

هیوای چاوێکی ساغه" ئەویش پاش حەڤدە ساڵ چەندین پشکنینی مانگانەی چاوەکانی لە لایەن باشترین پزیشکی ئەو وڵاتە، بێهودە بوو، کەچی هەر هیوا بڕاو نەبوو، سوور بوو لەسەر چاکبوونەوەی چاوەکانی ئەوسا هەندەران جێبێڵێ. جاروبار شەوباشی لە زەردە دەکردو دەچووە ژووری نووستنی، پێش نووستن، دۆڵابەکەی دەکردەوە، تێر بۆنی جلوبەرگە تایبەتەکەی دەکرد، بۆنی نێو باخ، جێپەنجەی ڕاز، دایکوبرا و خوشکەکانی، ئەو دەمەتەقێیەی دەهاتەوە یاد کە تازە ئەو جلەی لەبەرکردبوو، پیرۆزباییان لێدەکرد، گیرفانەکانی پڕ ببوون لە بۆن، گیرفانێ بۆنی هەناسەی گەرمی (ڕاز)ی لە خۆگرتبوو، یەکیان بۆنی هەناسەی دایکێك، یەکیان بۆنی ماندووبوون ومەرگەسات، دیمەنی کارەساتە دڵتەزێنەکانی دەهێنایەوە یاد، تا خەو دەیبردەوە چەندین خەیاڵ یەخەی بەرنادا، لە گێژاوی دەریای قووڵ و بێبندا مەلەی پێدەکرد، وە نەبێ لە خەودا بە ئارامی نووستبێ، بەڵکو نیشتمان دەرگای لێوالآ دەکرد، ئەو فیلمە ترسناکەی دیمەنەکانی وەك نووکی نەشتەر دەچەقینە دڵ ومێشك ودەروونی، ڕای دەچڵەکاند، دەرگای نیشمان دادەخرا، بە هەناسەبڕکێو دەردانی ئارەقێ زۆرەوە ڕاستدەبووەوە، بەڵام ئەو چاوەی نەختێ لەوەو پێش ڕەشماڵی هەرە ڕەشی دوژمنی بەسەر ئاسمانی شارەکەیەوە دەبینی، هەڵاوی ڕەشی، گەڕەك بە گەڕەك و کۆڵان بە کۆڵانی شارەکەی دەکرد، ئامێزی دایك و باوك بۆ جگەرگۆشەکان سارد دەکردەوە، گڕی

ئاگری لە درەختی جێژوانی ئاشقان بەردەدا، دەیبینی چۆن لە ترسی مەرگەساتێکی چاوەڕوان نەکراو، ژن و منداڵ، گەنجان و بەساڵاچوان هەڵپە دەکەن تا خۆیان ڕزگار بکەن، لە تەمێك، بۆنی سێوی بۆگەنی تێزاب ئاسای لە خۆگرتبوو، وریانی دەکرد، پاش بڕینی چەن هەنگاوێکی خێرا، چنگەکرێییێ بۆ ڕزگار بوون، لە پاڵێکا و هێدی هێدی بەدەم ئازارەوە پاڵدەکەوت، چاوەکان بە خوڕ فرمێسکی لێدەهاتە خوارێ وسوور هەڵدەگەڕا، بۆ دواجار گیانی پاکی دەسپارد، چاوەکان ڕوو لە ئاسمان دەبوونەوە، سکاڵایەکی بەڵگەداریان بە خوایان ڕادەگەیاند، کەف لە دەمیانەوە دەهاتە خوارێ، دەستەکان ڕەقدەبوون، بینینی منداڵی ساوا لە ئامێزی دایکیا، تلیسانەوەی پێستی ناسکی بەو ژەهرە، جەرگ بڕییەکی دیکەی ئەو کارەساتە دڵتەزێنە بوو.

ئەو کارەساتە زۆر کاری بوو، باری دەروونی بە تەواوی ئالۆزانبوو هەر بۆیە ئەمجارەیان بڕیاریدا بچێتە لای دکتۆرێکی دەروونی، ئەویش بۆ چارەسەرکردنی، داوای کرد شوێنەکەی بگۆڕێت، زۆر بۆ کەناری دەریا بچێت تا دڵی ئارامبێتەوە، هەر بۆیە پاش یەك مانگ گواستیانەوە، بۆ خانوویەك کە دەیڕوانییە کەناری دەریا.

لەو کەنارە، خەیاڵ دەیبردەوە، وەك شەپۆلەکانی دەریا، هیواو خۆزگەکانی ناخی شەپۆلیان ئەدا، باری دەروونیان ئالۆز کردبوو، زۆردکتۆری کردبوو، تا یەکێ لە هیواکانی(ڕووناکی بینین) بوو، چارە بکەن، بەڵام چارەسەری نەبوو.

خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە بواری کۆمپیوتەر بە باشترین نمرەوە بوو، هەمیشە خۆی بە قەرزاری ئەو ولاّتە نامۆیە دەزانی کە جیاوازی ناکات لەگەڵ خەڵکی ڕاستەقینەی شارەکە.تەنیا هیوایێ بۆ ئەو مابێتەوە بۆ ئەنجامدانی خواستەکانی هاتووچۆی کەناری دەریا بوو، بە زەردەی دەگوت بەرەو کەنار بمبە، ئەویش پەتەکەی دەستی پێئەداو بەرەو کەنار دەیگەیاند.زەردە ئەو هاودەمە هەمیشەییەی بوو، وەك خوونەریتی باوو باپیرانی بە وەفا وبە ئەمەك بوو.

تەنیا شوێنێك دڵی لێکراباوە، ئەو کەنارە بوو، هەمیشە لەگەڵ شەپۆلەکان دەدوا، گوێی بە دەنگی ئەو خەڵکەی کەناری دەریا دەکرایەوە، زۆرجار لەگەڵ ڕاهێنەرەکەی چووبوو، پێکەوە پیاسەیان دەکرد، لە ڕۆژانی گەرما مەلەیان دەکرد، خۆی نەیدەزانی وا جوانە، بالاّ بەرزییەکەی سەرنجی زۆری ڕاکێشاوە، لە کاتی مەلەکردن کچان خۆیان لێنزیك دەکردەوە، ئاو پرژێنیان دەکرد، وایاندەزانی ئەو چاویلکە ڕەشە، بۆ جوانی یاخود بۆ نێو ئاوەکە لە چاوکردووە، بەلاّم کە بینییان ئاوڕ ناداتەوە، وەك کەسەکانی دیکە ئاو پرژێنیان ناکاتەوە، بۆیان دەردەکەوت نابینایە، پاش مەلەکردنەکە، زەردە گۆچانەکەی پێدەگەیەنێ و پەتەکەی ملی خۆی دەتاتە دەستی، جگە لەوەی زیرەکی زەردە سەرنجیانی ڕادەکێشا، بەزەییشیان بە نابینایی ئەو لاوە قۆزە دەهاتەوە، توکی ڕەشی سەرسینگی، لە سەر پێستێکی سپی

سەرنج ڕاکێش، کچانی دەبزواند تا بە پەنجەی ناسکیان شانەی بکەن، سووروسپییەتی ڕوخساری پاش مەلەوان پەمەیی خۆی دەنواند، دەیکردە جوانترین لاوی کەناری دەریاکە، وێڕای نابینایەکەی کچانێکی زۆر دەیانویست پێوەندی لەگەڵ بکەن ولە خزمەتیابن، نەك وەك بەزەیی پیا هاتنەوە، بەڵکو وەکو خۆشەویستی یان هاوڕێیەتی، کە لای ئەوان باوبوو، زۆر کەس بۆ ئەو هاوڕێیەتییە یەخەیان پێدەگرت، بەلاّم لە هەموو جارەکان ئاهێکی لە ناخەوە هەڵدەکێشاو بەو جۆرە هاوڕێیەتییە ڕازی نەدەبوو، دەگەڕایەوە ئەو خانووە خنجیلەیەی لە سەر کەناری دەریا پێیان بەخشیبوو.گەر ڕۆژێك بۆ کەناری دەریا نەچوایە ئەوا هەر لە بەلەکۆنەی خانووەکەیەوە بە شنەبای ئەو کەنارە خۆی باوەشێن دەکرد.

جگە لە نامۆیی و هیوای چاوێکی ساغ، تامەزرۆی ڕۆژێ بوو لەگەڵ هاوزمانی خۆی بدوێ، چیدی لەگەڵ زەردە یا خودی خۆی قسە نەکات، هێند زەردەی بانگ کردبوو و قسەی لەگەڵ دەکرد، بە تەواوی لە زمانی گەیشتبوو، بەختی ئەو وابوو، لەو شارە هاوزمانی خۆی تێدا نەبوو، چونکە ڕۆژێ لە ڕۆژانی ئەو حەڤدە ساڵە لە بازێڕ و پارکەکان و کەناری دەریا تووشی کەسێکی وانەبوو.

## ( ٢ )

جەژنی سەری ساڵ بوو، بەو بۆنەیەوە، لە شارەکان ساڵانە ئاهەنگ دەگێڕدرا، ئەو شەوە تا بەیانی چەندین تیپی مۆسیقا لە یانەکان و سەرشەقامەکان ئامادەبوون لە خۆشی هاتنی ساڵی تازە ئاهەنگ بگێــڕن، لــە کاتــژمێر دوازدەی شــەوێوە زیاتردەهاتنــە جــۆش وخرۆش.بڵند تەنیا لە سەری ساڵی کوردی وسەری ساڵی زایینی ئـەو جلـە کوردییانـەی لەبـەردەکرد کـە چـەندین سـاڵە لـە دۆلابـە تایبەتەکەی پاراستبووی تا نەڕوشێت وکۆن نەبێت، چونکە زۆر لای پیرۆز بوو، داینابوو، هەر کاتێ گەیشتەوە شارەکەی لەبەری بکات، یەکەمین ڕۆژی لەبەرکردنی ودوا جاری ژوانی لەگەڵ (ڕان)ی دەهێنایـەوە یـادە پیرۆزەکـانی، هـەروەها دەیویسـت گـەر کوردێـك بیـنی بێـت بـە لایـەوەی و دەردەدڵـی خـۆی بـە بەسـەرهاتەکانی بـۆ هەڵڕێـژێ. ئـەو شــەوە لەگـەڵ زەردە تـا نیوەشــەوێکی درەنـگ لــە پیاسەی شەقامەکانی نێو شارەکە بوون، هەموو بیروهۆشێکی لای دەنگـی خـەڵك و ئـەو جەنجاڵییـە بـوو، بـە تایبـەتیش دەیویسـت وشەیەکی کوردی، تەنیا یەك وشە لە نێو ئەو هەموو زمانەی گوێی لێدەگرتن هەڵبـژێرێ، پێدەچوو خۆشبەختی ڕووی تێکردبێ، ئەو شــەوە ئــەو جەژنــەی لێبــووە دوو جــەژن، تــەزوویێ ســەراپای

جەسـتەی وروژان، بـە هـۆی پەتەکـەوە، تەنانـەت زەردە هەسـتی پێکرد، لە شوێن خۆی وەستا تـا بە تـەواوی زانـی کوردن.دەنگی ناسکی کچە کوردیٚ، (ئالان ئەو کوڕە کوردە دەبینی چەند قۆزە بـەو جلـە کوردییـەوەی، پێدەچـیٚ نابینـابیٚ!!).(نیـان گیـان ڕاستدەکەی بە ڕاستی جێی داخە، سەیرە دەڵێی خەون دەبینم لـەم نیوەشـەوە، لـەم شـارە نامۆیـە، کەسـێك دەبیـنم جلـی کـوردی لەبەردایە!!)، پێشئەوەی ئالان ونیان پرسیاری لێبکەن، یەکسەر بە دەنگیٚ بەرز گوتی قوربانتانبم مەڕۆن و وەرنە نزیکمەوە، ئێوە دوو فریشـتەن و خـوا بـۆ مـنی نـاردوون، پـاش هەواڵپرسـینێکی گـەرم، ئـالان گـوتی ئێمـە باسـی تۆمـان دەکـرد، لـەم شـارەدا تـەنیا تۆمـان بینیـووە کوردبێـت، بـانگیتیش نـەکردبا ئێمـە هـەر نزیکـت دەبووینـەوە.سـوپاس، منـیش هێنـد هەسـتم لاتـان بـوو، تەنانـەت دەزانم ناوتـان (ئـالان و نیـان)ە. گوتیـان زۆر ڕاسـتە، ئـەی بـەڕێزت ناوت چییە؟ گوتی (بڵند)، ئەم سـەگەش نـاوی زەردەیـە. نیـان وتـی بەڕاستی سەگێکی جوانە، پێدەچیٚ زۆر زیرەك بیٚ.

– ئـەم سـەگە تایبەتـە بـە نابینایـان، زۆر ئاسـانکارییم بـۆ دەکـات، ناوی دیکەی هەبوو، بەڵام من ناوی کوردیم لێناوە.

ئالان :پێتنەگوتین خەڵکی کوێی؟

– ئێمـە بـەم نیوەشـەوە ولـە چـەقی ئـەم ڕێگەیـە وەسـتاوین و دەمانـەویٚ هـەموو شـتیٚ لـە بـارەی یـەکترەوە بـزانین، مـن وا بـۆ حەڤدەساڵ دەچیٚ لە چاوەڕوانی هاوزمانێکم تا دوو قسەی لەگەڵدا

بکـەم و هـەواڵی نیشـتیمان بـە تـەواوی بـزانم، دەتانـەوێ هـەر بـە سـەرپێییەکەوە کـەمێ دەمەتـەقێ بکـەین و جێم بێڵن، وا شـەویش درەنگـــی کـــرد، کـــاتی ئـــەوە هـــاتووە بچـــینەوە مـــاڵی ئێمـــە و پشووبدەین، ئەوسا زۆر شت لە بارەی یەکدییەوە دەبیستین.
ئالان: ئێمە بە نیازی ئوتێلین ، بەڵام جێتناهێڵین ودڵت ناشکێنین، دەفەرموو با بڕۆین بۆ ماڵەکەت.
لـە خۆشـیاندا، پەتەکـەی زەردەی ڕاوەشـاند و گـوتی زەردە بـەرەو مـاڵ، زەردە ڕێـی چـوونەوەی مـاڵی گرتەبـەر، هـەر بـە گفتوگـۆوە گەیشتینەوە.نیان زۆر بە سەرسامییەوە گوتی:
بەڕاستی شوێنێکی خۆشودڵگیرت هەیە، بەڵام یەکسەر بێدەنگبوو، چیدیکەی نەگوتەوە، حەزی نەکرد هەستی بڵند بریندار بکات.
- گوتی بەڵێ نیـان خـان ڕاهێنـەرەکـەمیش وایـدەگوت، بـەڵام بـە مـن چیی، خۆ من هیچ نابینم.
ئالان: بە داخەوە، دیارە چارەنووست وایە.
بڵنـد :چـاوەکانم گەشـوجوان بـوون، بـەڵام خـوا ئـەو کەسـە بگـرێ چاوەکانی پوکاندم، گەر باسی خۆم بکەم دەبێ تا بەیانی دانیشین، جارێ وا چاکە هەستم و خواردنێ ئامادە بکەم.
نیان:ئەی ئێوە خوشکتان بۆچییە، هەر ئێستە دەچمە مەتبەخ و باشترین خواردنتان بۆ ئامادە دەکەم.
بڵند:دەترسم ماندوو بی.

– به پێچەوانەوە، بەڵام تا من دانەنیشم، نامەوێ بەسەرهاتت باس بکەی، چونکە دوایی پێت دووبارە دەکەمەوە.
– تۆ بڕۆ، من گوێ لەسەرگوزشتەی ئێوە دەگرم.بە (ئالان)ی گوت وا دیارە خوشك وبراییتان زۆر خۆشە، خوا لێکتان نەکا.
– سوپاس، ئەی تۆ خوشکت نییە؟
– ئاهێکی لە ناخەوە هەڵکێشا، لەگەڵ ئەو ئاه هەڵکێشانە، پەشیمانی ئەو پرسیارە بە ڕووی ئالانەوە دیاربوو.
– خوشك و براو کەسوکارم لە دەستداوە، تەنیا هیوام، (دایکم) و(ڕاز)ی خۆشەویستمە، کە بەڵێنماندابوو بۆ یەکبین، ئێمەش بە هەزار چنگەکڕێ لەو مەرگە ساتە خۆمان ڕزگارکرد وخۆمان گەیاندە سنوورەکان.ئەویش سەرگوزشتەیەکە، کەی نیان هات دانیشت باسیدەکەم، بەڵام ئێستە حەزدەکەم باسی خۆتان بکەی.
گوتی :هەر کوردێ ببینی، چەندین سەرگوزشتەی ڕاستەقینەی پێیە، جا چ لە خودی خۆی، یا کەسێکی دیکە، منیش زۆری نەمابوو بە ئاسانی گیان لە دەسبدەم وجارێکی دی خوشك و کەسوکارم نەبینمەوە بە هۆی ڕێی قاچاغەوە.
– ئەی (نیان)ی خوشکت؟
– ئەو بە هۆی ئەوەی مێردی لێرە پەناهەندەییان پێداوە، بە شێوەی فەرمی وبە فڕۆکە گەیشتووە، بەڵام ئێستە مێردی یەك مانگ مۆڵەتە وچووەتەوە کوردستان، ئێمەش بە هەلمانزانی پێکەوە بەم شارانەدا بگەڕێین.ئێستێك بێدەنگبوو، دەسی لەرزۆکی

خستە نێو دەسی بڵندەوە بە پەڵمە گریانەوە گوتی من دوو جگەرگۆشەم لە تەمەنی چوارساڵی و حەوتساڵی جێهێشتووە، شەو نییە خەویان پێوە نەبینم، دڵنیام جارێ بەم زووانە نایانبینمەوە، چونکە هێشتا کاتم ماوە بە فەرمی پەناهەندەییم بۆ دەرچێ.

بڵند:(ئەی بە من دەڵێی چیی، گەر بچمەوە دەبێ بە کێلی سەر گۆڕەکانیان دڵم هێوربکەمەوە)، لەو کاتەدا نیان چووە لایان گوتی کاکە گیان، دیسانەوە بۆ وا لە خۆت دەکەیت، دڵی کاک بڵندیش تەنگدەکەی، دەفەرموون خواردن ئامادەیە با نانەکەمان بخۆین.

بڵند :داوای لێبوردندەکەم دڵم ئێشانی لەم کاتی نانخواردنە.چوون بۆ نانخواردن وبڵند گوتی دەستت خۆشبێت بە ڕاستی زۆر بە زوویی ئامادەت کرد.

پاش نانخواردن نیان یارمەتی لێوەرگرتن چووە گەرماو وپاشان دەرچوو چایەکی بۆ کردن وگوتی ئێستە کاک بڵند باسی سەرگوزشتەی خۆتمان بۆ بکە.

- من لە خێزانێکی بەختەوەر چاوم هەڵهێنا، سێ برا و سێ خوشك بووین، من نۆبەرە بووم، لە هەموویان گەورەتر بووم، لە تەمەنی دوازدە ساڵیمەوە باوکم گیانی پاکی سپارد و ئیدی من و دایکم کاروباری ماڵ و منداڵەکانمان دەبردە ڕێوە، بەڵام بە هۆی ئەوەی ڕەز وباخی تایبەت بە خۆمان لە دەرەوەی شار هەبوو، گوزەرانمان زۆر باشبوو، لە خوێندنیش زۆر زیرەك بووم، بە

نیازبووم باشترین نمره به دەست بێنم تا ببم به دکتۆر، چونکه هەموو هیوام بوو، بەڵام نەمدەزانی ڕۆژێك دێت و چاوەڕوانی دەستی دکتۆرێك دەبم تا کەمه هیوایەکی بینینم پێببەخشێ.

ئالان :کەواته تۆ چاوەکانت ساغبوون؟

– چاوەکانم نەك هەر ساغ ، بەڵکو زۆر جوانبوون، زۆرجار دایکم زۆر به تامەزرۆوه تەماشای دەکردم، دەستەکانی بەرزدەکردەوه بۆ ئاسمان و پڕ به دڵ نزای دەکرد، پاشان ڕووی تێدەکردمەوەو دەیگوت یاخوا کوڕەکەم ئەو چاوه جوانانەت دووربێت له چاو پیسان.

نیان: دایکت ئێسته له کوێیه؟

– نازانم دایکم ماوه یا نەماوه، ئەوەنده دەزانم له کیمیاباران کردنی شارەکەمان به زیندوویی گەیشتینه سنوور، له سنوورەوه تا تاران پێکەوه بووین، پاشان منیان بۆ ئەم وڵاته گواستەوه، چونکه کیمیابارانەکه کاری له چاوەکانم کردبوو، لەوێ چارەسەرم نەبوو، ئیدی لەوێوه لێکجیابووینەوه.قۆناغی سەرەتایی و سێی ناوەندیم به باشترین نمرەوه تەواو کرد، چوارەم و پێنجەمی زانتییش هەر بەو شێوەیه، دەمویست له پۆلی شەشەمی زانستی نمرەیەکی بەرزبه دەستبێنم و بچمه کۆلێژی پزیشکییەوه، تا هیواکەم بێته دی، چونکه کاتێ بۆ نێو بازاڕی شار دەچووم، به شەقامی کلینیکی پزیشکان تێپەڕدەبووم، تەماشای تابلۆ هەڵواسراوەکانی دکتۆرەکانم دەکرد، ئاواته خوازبووم ڕۆژێك وەك

ئەوانم لێبێ و کلینیکی تایبەتی خۆم لەو شەقامە هەبێت، هێند بە تامەزرۆوە تەماشام دەکرد، ناوی خۆم لە نێو تابلۆ نوسراوە هەڵواسراوەکان دەبینی، با لێتان نەشارمەوە، جگە لە خوێندن و کارکردن لە نێو ڕەز و باخەکەمان، خۆشەویستیم لەگەڵ کچێ بە ناوی (ڕاز)وە دروستبوو، زۆر هاوڕێی(شەونم)ی خوشکم بوو، هاوتەمەنیش بوون، کچێکی زۆرجوان بوو، کاری لێکردبووم و لە ناخی دڵەوە خۆشمدەویست، ئەوانیش لە تەنیشتی ئێمەوە باخیان هەبوو، بەڵام لە نێو شار ماڵیان لە گەڕەکێکی دیکەبوو، سەرەتا نەمدەزانی چۆن پێیبڵێم خۆشمدەوێی، بە ناچاری نهێنی دڵی خۆم لای شەونم درکاند، شەونم پێیگوتم(کاکە بڵند ئەویش زۆر ناوت دێنێ)، بەڵام هەستدەکەم شەرم دەکات بڵێت براکەتم خۆشدەوێ.منیش گوتم ناتوانێ سبەینێ بەیانی لە نێوباخ پێیبڵێی.گوتی زۆر بە خۆشحاڵییەوە، دەزانم لای ئەو خۆشترین مژدەیە بڵێم کاکە بڵندم تۆی خۆشدەوێ، دڵنیام لە مێژە چاوەڕوانی ئەو هەواڵەیە، گوتم دەبێت ئەویش منی خۆشبوێ؟ گوتی کاکە گیان تۆ هێند قۆزی نەك هەر ڕاز تا ئێستە چەندین کچی دیکە لای خۆم باسی جوانی و قۆزیت دەکەن، بەڵام من خۆم لێگێل کردوون وحەزم نەکردووە بۆتی باسبکەم، گوتم شەونم گیان، نامەوێ خۆت لە ڕاز گێل بکەیت و دەمەوێ هەر سبەینێ وەڵامم بداتەوە، پێیبڵێ کاکەم خۆشەویستییەکەی پاك وبێگەردە، دڵنیای بکە، گەر ڕازی بێت وخۆشەویستی منی لە دڵدا بێت، ئەوا

یا بۆ یەکدیەبین یا بۆ گلێ. شەونم گوتی دڵنیابە تۆی لە خۆی خۆشتردەوێت، ئینشەڵڵا هەر بۆ یەکدی دەبن.گوتم دەکەواتە سبەینێ پێیبڵێ، بەڵام دەبێت زۆر نهێنی بێت.هەر بۆ سبەی بەیانی زوو هەستام، زۆر دڵم خۆشبوو، ئیمڕۆ شەونم بە ڕاز دەڵێت، هەر بۆیە لەبەر ئاوێنەکە لا نەدەچووم و هەر خەریکی جوانکردنی خۆم بووم، شەونم بە پەلارەوە پێیگوتم کاکە (خەریکە ئاوێنەکە لێت بێتە وەلام).

گوتم زۆر دڵخۆشم، خۆتیش باش دەزانی.

بە پیکابی تویۆتاکەمان هەر وەك کاری ڕۆژانە، من و شەونم و دایکم چووین بەرەو نێو ڕەزوباخ، بەڵام ئەوانی دیکەمان جێهێشت، کە دایکم سواربوو گوتی کوڕەکەم ئەم بۆنە خۆشە چییە؟گوتم دایکە گیان تازە کڕیومە، بۆنێکی خۆشە یا ناخۆش؟ تا دڵم پتر خۆش بکات، یەکدووجارێ هەڵمژینێ توندی کرد و پاشان گوتی بە ڕاستی بۆنێکی خۆشە، شەونم دیسانەوە پەلارێکی تێگرتم و گوتی ئەوڕۆ کاکە زۆر خۆی جوان کردووە و زۆریش دڵی خۆشە.گوتم دایکە گیان من هەروانەبوومە؟گوتی تۆ هەروا دڵخۆش بوویتە وجوانی وەك تۆ لەم شارەدا نییە. گوتم دایکە گیان لەوانەیە هەر لای تۆ وا جوان دیاربم، چونکە پێشینان گوتوویانە "ژیژك دەڵێت لە بێچووی من نەرمتر نییە"دیسانەوە شەونمی خوشکم پەلاری لێدامەوە گوتی نا کاکە بڵند لای زۆری دیکە جوان وخۆشەویستی. بە زەردەخەنەیەکەوە تەماشای (شەونم)م کرد،

ئیدی بێدەنگبووم و کاسێتێکی (مەزهەری خالقی)م خستەسەر ڕیکۆردەرەکەو خستیمیە نێو دەریای خەیاڵەوە، بەو خەیاڵەوە تەماشای پێشی خۆم دەکرد و لەسەرخۆ پیکابەکەم دەهاژووت.لە پڕێکدا(هەڵۆ)ی برای ڕاز بە پیکابەکەیان بە تیژی و هۆڕن لێدانەوە بەلاماندا تێپەڕی، دایکی و ڕاز لە پێشەوە دانیشتبوون، برا وخوشکەکانی دیکەی لە دواوە، دڵم پتر خۆشبوو، ڕاز هاتووە. هەڵۆ زۆر لاوێکی بە زەوق و گاڵتەو بەزم خۆشبوو، کاسێتێکی هەورامی خستبووە سەر ڕیکۆردەری پیکابەکە ودەنگی دابوویێ، منیش دەنگی ڕیکۆردەرم زیاد کرد، پێم لە بەنزیننا، تا گەیشتمە ڕاستیان و بەیانی باشم لێکردن، چاوم بە ڕاز کەوت، جوانییەکەی بێوێنە بوو، (تیشکی ڕۆژی دەمەوبەیان، کوڵمەکانی ئاڵتر، پەمەییەکی کاڵی بە ڕوومەتەکانی بەخشیبوو، جوانی چاوە گەشە قاوەییە کاڵەکەی جوانتر دەرخستبوو، بزەیەکی بێوێنە دوو لێوی پەمەیی کاڵی نەخشاندبوو، قژێکی خاو وڕەش، وەك خەرمانەی دەوری مانگئاسا، ڕووی سپی و ئاڵی زیاتر دەرخستبوو، کە دەستی بەرزکردەوە، پەنجە ناسکوسپییەکەی تەزووی بە جەستەمدا تێدەپەڕاند، زەردەخەنەی ئەو بەیانییەی(تا ئێستەش لە نێو چاوە نابیناکەم وێنای هەر ماوەو وبە کیمیابارانیش نەسڕاوەتەوە!) ڕووی جوانتر کردبوو، تەنانەت چاوە جوانەکانی پێدەکەنین، نەك ئاوی لە چاوانم دەرهێنا تەنانەت دڵیشم ئاوی لێدەچۆڕا، تا گەیشتینە نێو باخەکانمان بە قۆشمەو زەوق و

گۆرانی و کێبڕکێ بە ئۆتۆمبیلەکان بردمانە سەر، باوەڕم پێبکەن گەر ئێستە خەڵکی بەو شێوەیەی ئێمە بە لامدا تێپەڕن، دەڵێم بەرەڵان ولەوانەشە هەبێت جنێویانیش پێبدا، بەڵام قۆناغێکی تەمەنە و وای لێتدەوێ.لە سێبەری دارێك وەستام، شەونم بە پەلە دابەزی بەرەو لای ڕاز(وامدەزانی یەکەمجارمە بەو جلوبەرگە مۆرە سادەییە ئاوریشمییە کوردییەی، بالاَ بەرزییەکی بێوێنە، کەمەرێکی باریك و سینگێکی دەرپەڕیوو بە دوو لیمۆی تازە پێگەیشتووم. بینیووە)، لە دوورەوە باوەشیان بۆ یەکتر کردەوە، منیش هەرچاوێکم لایان بوو، چاوەڕوانی هەواڵێکی خۆش بووم ئاخۆ دەبێت ڕاز منی بە دڵ بێت یا دڵی بە یەکێکی دیکەوەیە و من نایزانم، کەمێ خۆمگرت وچاوەڕوانیم کرد، پاشان توانام نەماو تەماشایەکی دیکەم کردن، دیاربوو بۆی باسکردبوو، چونکە تەماشایان دەکردم و ڕاز بە خەندەیەکی شەرماوییەوە دەیڕوانیم، حەزمدەکرد زوو شەونم بگەڕێتەوە تا وەڵامی (ڕاز)م بە تەواوی پێڕاگەیەنێ، هێند پەلەم بوو خەریکبوو خۆم بانگی بکەمەوە، لە پڕ بینیم بەرەو لای دایکی ڕاز ڕۆیشتن، زۆر ترسام، گوتم شەونم دایکیشی تێنەگەیەنێ، کەمێ قسەیان کرد و ئیدی دوورکەوتنەوە، بەڵام دیاربوو ڕاز حەزی دەکرد هەواڵەکەم زوو پێڕابگەیەنێ، هەر بۆیە بە پەلە ماچی یەکدیان کرد و شەونم گەڕایەوە.خۆم لە دایکم دوورخستەوە تا پێنەزانێ، ئیدی شەونم هاتە لامەوە و گوتی کاکە گیان خۆشترین هەواڵم پێیە، یەکسەر تێگەیشتم وگوتم وا بێت

ڕازی بووە.گوتی نەمگوت کاکە گیان زۆری خۆشدەوێی، دەیگوت با دڵنیا بێت بەڵێنی ئەدەمێ هەر دەبێت بۆ یەکدیبین.گوتم ئەی چۆن لە نزیکەوە قسەی لەگەڵ بکەم؟ شەونم وتی هەواڵێ خۆشی دیکە، بانگێشتم کردووە، ئەم نیوەڕۆیە لە سەر خوانی ئێمە نانەخوات، چونکە یارمەتیم لە دایکی وەرگرتووە.گوتم زۆر سوپاس شەونم گیان دەبێت دیارییەکی زۆر جوانت پیشکەش بکەم.گوتی هەر بۆ من؟ وتم دەزانم دەڵێی چیی، دڵنیابە بۆ ئەویش.

تەماشای لای باخەکەیانم کرد، ئەوەندەی دڵم بە باخەکەی ئەوان دەکرایەوە، بەوەی خۆمان وانەبوو، هەستم دەکرد ئەو شنەبایەی لەوێوە دێت وڕووم فێنک دەکاتەوە جیاوازترە، لەگەڵ هەر هەڵمژێنێکی وادەزانم هەناسەی گەرمی ڕازەو ناخم پاکدەکاتەوە. کە ئێمەش قسەمان دەکرد سەرنجی لای ئێمەی دابوو، چاوەکانی بۆمان پێدەکەنی، هێند دڵخۆشبوو دەترسام ئاگاداری خۆی نەبێ و هەڵۆ یا دایکی یا ئەوانی دیکە هەستی پێبکەن، هەر بۆیە زیاتر سەرنجم نەدایێ، لەگەڵ شەونم کەوتینە کاری نێوباخ وڕەزەکەمان.

نیوەڕۆ هات، لە چاوەڕوانی بووم، چاوم لە ڕێبوو دەربکەوێ، بەلاّم پێدەچوو شەرم بکات، هەر بۆیە بە (شەونم)م گوت هاوڕێکەت هەر دەرنەکەوت؟گوتی لەوانەیە شەرم بکات، هەر ئێستە خۆم دەچم دەیهێنم.بە پەلە چوو، دەست لە نێو دەست، بە گاڵتەو پێکەنین و قسەی خۆشەوە دەهاتن، نەمدەزانی هێند شەرمنۆکم، بڕواتان بێت

لـە گـەڵ نزیـکبوونـەوەیان چـۆکم دەلـەرزی، تـەواو نزیـکبـووەوە و سلاّوی کرد، زمانم لاڵ ببوو، نەمدەزانی بۆ وا بە دەنگێکی نـەوی وەڵامـم دایـەوە.ئـەوان ڕۆیشتن بـۆ نێـو کەپرەکـە، بـۆ سـەر خـوانی نـانخواردن، هـەنگاوم بـۆ نـەدەنرا تـا بچـم دانیشـم تێـر تەماشـای چـاوەکانی ڕاز بم، شـەونم بـانگی کـردم کاکـە گیـان وەرە بـا خواردنەکـە سـارد نەبێتـەوە، چـووم و خێرهـاتنم کـرد، زۆر بـە شەرمەوە وەڵامی دامەوە، چاوەکانی لێدەشاردمەوە، ئەو دانیشتنە خۆشترین ساتم بوو، باوەڕم نەدەکرد (ڕاز)ەو پێکـەوە نـانـدەخۆین، جاروبار بە نـازێکی کچانییەوە لەگەڵ شـەونم قسـەی دەکـرد، ئـەو دەنگەی تا ئێستەش لە گوێمدا دەزرینگێتەوە، چەندجارێ بە تیلی چاوەکانم تەماشـام کـرد، ئـەویش جـارێ لـەو جارانـە بینیمـی، لـە شـەرما کوڵمـەکانی سـوور هەڵگـەڕان، دڵـم دەلـەرزی، هێنـد بـە تامەزرۆوە تەماشای چاوە جوانەکانیم دەکرد وا هەستمدەکرد نـە دایکم نە شەونم لامانەوە دانەنیشتوون.

پـاش نانخواردنەکـە ، گفتوگـۆ و قسـەکردن دروسـتبوو، سـەرەتا پرسـیاری پچڕپچڕم لێـدەکرد، ئـەویش بـە وەڵامـی کـورت وەڵامـی ئەدامەوە، دایکم چوو بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن، من و شەونم و ڕاز لە ژێـر کەپرەکـە ماینـەوە، شـەونم دەیویسـت هەسـتێ و جێمـان بێڵـێ ئـەو تونـد دەسـتی شـەونمی گرتبـوو، بـەڵام شـەونم گـوتی ڕاز گیان هـەر ئێسـتە دێمـەوە، خـۆ کاکـەم نـاتخوا.تـەنیا مـن و ڕاز لـە ژێـر

کەپرەکەماینەوە، نەمدەزانی چیی بڵێم ولە کوێوە دەستپێبکەم، تەماشای چاوەکانیم کرد وگوتم دەزانی زۆر لە مێژە خۆشمدەوێی؟ بە دەنگێکی ناسك ونەوی وتی چۆن خۆشەویستییەك؟

وتم خۆشەویستییەکی پڕ لە عیشقوجوانی، وەك خۆشەویستی بولبول بۆ گوڵ، بەفر بۆ چیا، زەوی بۆ ئاسمان، بیابان بۆ باران، کوردستان بۆ ئازادیی، خۆشەویستی وەلی بۆ شەم، نازانم خۆشەویستیت بە چیی پێناسە بکەم و بە چیی بەراوردی بکەم، تەنیا ئەوەندە دەتوانم بڵێم زۆر خۆشەویستی لە دڵدا، زۆرم خۆشئەوێی، بەلاّم نازانم تەنیا هەر من خۆشمەوێی و ئیشقت بووم؟ ڕاز چاوەکانی هەڵبڕی، نەمدەزانی چۆن سەرنجی چاوە مەستەکانی بدەم، باوەڕم پێبکەن، تەزووی خۆشەویستی سەراپای جەستەی ورووژاندبووم، کەمێ شەرم یەخەی بەردابووم، بەو دەنگە بە سۆز و ناسکەی، گوتی بۆ وا ئەزانی من تۆم خۆشناوێ؟! دڵنیابە لە خۆم زیاتر خۆشمئەوێی، گەر بۆ تۆش نەبم، ئەوا بۆ گڵم، شەم چیی بۆ وەلی کرد من زیاتر، دڵنیابە خۆشەویستیم پاك وبێگەردە، ئەشك لە چاوانی قەتیس مابوو هێندەی دیکە چاوانی جوانتر کردبوو، وتی بەلاّم تۆش وابە، خۆشەویستییمان بە هیچ شتێ مەگۆڕەوە.

لەو کاتەدا شەونم هات، فرمێسکە پاك و بێگەردەکانی ڕاز، (وێنەی ئاورینگ لەسەر پەڕەی گوڵ)، بە ڕوومەتەئاڵەکەی هاتە خوارێ، سەرەتا شەونم ترسا و گوتی ڕاز گیان چیی بووە؟

ڕاز ئاورینگی بە دەستوپەنجەی ناسکی لابرد و بەزەردەخەنەوە تەماشای شەونمی کرد و گوتی نازانم، شەونم گیان نازانم بۆچ دەگریم!!گوتم حەز دەکەن جێتان بێڵم؟تەماشایەکی کردم، زانیم حەز ناکات بڕۆم، هەر بۆیە گوتم گەر ڕاز بە دەستەکانی چایەکم بۆ تێبکا وبیداتە دەستم، ئەوا ناڕۆم.

شەونم گوتی چیی دەڵێی بڕوات یا نەڕوات؟

ڕاز دەستی بۆ قۆریەکە برد وچایەکی بۆ تێکردم و دایە دەستم، شەونم گوتییەوە وەڵامت نەدامەوە، ئێستە کاکەم بڕوات یا نەڕوات؟ بە گاڵتە و زەردەخەنەوە یەکدوو شەپێکی لە شەونم دا، گوتی، ئەی چام بۆ تێنەکرد.

ئیدی لەو ساتەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ خۆشەویستی لە نێو دڵمدا کڵپەی دەسەند، چەندینجار لە ژوانی وادا بە یەکدی شاد دەبووین، هەردووکمان حەزمان دەکرد قۆناغی خوێندن زوو تەواوبکەین وبە هاوسەرێتی دڵشادبین.

پاش سێ ساڵی پێوەندیی، ئەو بەیانییە، زۆر دڵخۆشبووم کە بۆ نیوەڕۆ لەگەڵ ڕاز nاندەخۆم، چونکە شەونم بانگێشتی کردبوو، لەبەرئەوەی ڕۆژی پێشووتر شەونم لای ئەو نانیخواردبوو، وێڕای ئەوەی شەرم لە نێوانمان زۆر کەمببووەوە، بەڵام هەموو جارێکی بەیەکدی گەیشتنمان واماندەزانی بۆ یەکەمجارە یەکدی دەبینین هێند ئیشق و خۆشەویستیمان کاریبوو.

خۆم بە جوانی ڕێکخستبوو ئەو قاتە کوردییەی لەو ڕۆژەدا لەبەرم کردبوو، ئەوەی بەرم کە پێش نەختێك دامکەند وهەر بە هۆی ئەو قاتەوە بە ئێوە ئاشنابووم، (دەمویست ئەو ڕۆژە هەلێك برەخسێ و خۆم پێی بلێم چۆنە بێین بۆ خوازبێنیت؟).

کاری ئاسایی ڕۆژانەی خۆمان دەسپێکرد لە دوورەوە خۆشەویستیمان ئەگۆڕییەوە، چاوەکانمان لە ئاستی یەکدی نەدەپروکان، ئەو ڕۆژە زۆر تەماشای دەکردم تا وایکرد، نزیکبمەوە وبلێم بۆ ئەوڕۆ وا تەماشام دەکەیت، چیی بووە؟! بێوەلامدانەوە، تەماشای سەراپای کردم وگریا، چەند دلۆپێ فرمێسکی بە چاوانەوە هاتە خوارێ.گوتم ڕاز گیان بۆ وا بێتاقەتی، خۆ هیچ نەبووە؟اوتی زۆر دەترسم نەگەمە ئەو ڕۆژەی بۆ یەکدیبین، زۆر دەترسم، بە تایبەت ئەمشەو خەونم پێتەوە بینی، لەو خەونەدا، (لافاوێ ڕووی کردە شارەکەمان، ئێمەیشی ڕاپێچ کرد، هەموو کەوتبووینە نێو گێژاوی لافاوەکەوە، کەس فریای کەس نەدەکەوت، خەلکی هەر لە هەولی ئەوەدابوو لەو لافاو و زریانە ڕزگاری بێت، بەلام تەنیا من وتۆ دەستمان لێکنابوو).وێڕای ئەوەی خەونەکەی دلی ترساندم، بەلام بە گالتە و پێکەنینەوە، گوتم بە ڕاستی خەونەکەت ڕاستە، چونکە ئەوڕۆ دەمەوێ خۆشترین هەوالت پێبلێم.

بە پەلە چاوەکانی سڕییەوە و گوتی توخوا چییە زوو بیلێ؟

گوتم کە ئەمساڵ لە قۆناغی ئامادەیی تەواو بووم، یەکسەر بۆ خوازبێنی دێم، ئەم نیوەڕۆیە کە هاتی بۆ نانخواردن، لەگەڵ شەونم باسی دەکەین، ئێستە من دەڕۆم تا نیوەڕۆ بە خوات ئەسپێرم.

کات نەدەڕۆیشت، دەمویست زوو نیوەڕۆ بێت وزیاتر لەو باسە بدوێین، تا کات گەیشتە یازدە، چەندینجار تەماشای نەك کاتژمێرەکە، جاروبار لەگەڵ میلەکە دەدوام و دەمگوت، دەتۆزێك پەلەکە بۆ هێند لە سەرخۆی، ئەی تۆ نازانی نیوەڕۆ کێ میوانە؟!

لە کاتژمێر یازدە و سیوپێنج خولەك بوو، دڵم خۆشبوو، زۆرنەماوەو خۆشەویسترین میوانم دێت، بە شەونمم گوت میوانەکە بۆ نەهات تا تۆزێ هاوکاریت بکات لە خوان ئامادەکردن.

شەونم گوتی وا دەچم خۆم دەیهێنم، چونکە شەرم دەکات.

ئەو ڕۆیشت ومنیش لە چاوەڕوانیدا بووم، بەڵام لە پڕ میوانێکی دڕندە ڕووی تێکردین، خەونەکەی ڕاز هاتە دی.لەگەڵ گرمەیەکدا، سەر شارەکەمان بووە دووکەڵێکی سپی، دایکم هاواریکرد وتی با زوو بگەینەماڵەوە، ئێستە منداڵەکان تۆقیوون، وا ڕێکەوتبوو ماڵی (ڕاز)یش تەنیا خۆی و هەڵۆی برای و دایکی هاتبوون، هەردوولا سواری پیکابەکانمان بووین تا بگەینەوە ماڵ، بەڵام گرمەکە زیادی کرد، ئاسمانی شار یەك پارچە دووکەڵ بوو، خەڵکی لە نێو شارەوە بەرەو دەرەوە ڕایاندەکرد، زریکەی منداڵ و هاواری ژن وپیاو دەنگیدەدایەوە، سەرەتا نەماندەزانی کیمیابارانە، تا بۆن سێوێکی زۆر بۆگەن بڵاوبووەوە هەر لەو ڕێیانە کیمیاکە کاری

کردبـوو، چـەندین کـەس لـەو ڕێیانـە بـە دەم ئـازارەوە گیانیـان سپاردبوو، هەر کەس دەیویست خۆی لەو مەرگەساتە قوتاربکات، گرمەکـە چـڕتر بـوو، ئێمەیشـی ناچـارکرد بگەڕێینـەوە وڕوو لـە سنوورەکان بڕۆین، چونکە دڵنیابووین و دەمانزانی گـەر بڕۆینـەوە ماڵ کۆتـایی بە ژیانمـان دێت، هـەر بۆیـە لەگـەڵ ماڵی ڕاز بە پەلـە گەڕاینەوە ڕوومان لـە سنوورەکان کـرد، بـەڵام نەگەیشـتینە نیوەی ڕێ، زیاتر نەمانتوانی پیکاب لێخوڕین، چووینە نێو باخەکانـەوە، گرمەکان نزیك ئێمە دەبوونەوە، بە پێ دەمانویست ڕوو لـە چیاکان ببینەوە و خۆمان بگەیەنینە لووتکەی شاخی دەوروبەری شار، لای ئاوێکەوە تێپـەڕ بووین، بینیم وا هـەڵۆ لێیدەخواتـەوە، هـاوارم بـۆ کرد، پاشـان بۆ ڕاز، بەڵام کارلە کـارترازا، گەیشتم پێموت بـۆ لـەو ئـاوەت خـواردەوە، ئـەی نـازانی ژەهراوییـە!!تەماشـای ڕازم کـرد، چـاوەکانی سـووربببوون، ڕووە ناسـك و بێگەردەکـەی هێنـد سـوور هەڵگەڕابوون، لە نزیکی تلیسانەوە بوون، بە گریانەوە پێیوتم، بڵند گیـان دەزانـی خەونەکـەم ڕاسـتبوو.قسـەم بۆنـەکرا، ملـی ڕێمـان گرتەوەبـەر تـا ڕزگـاربین، دایکـم هـەر هـاواری بـوو نەیـدەتوانی ڕێ بکـات، هـەر جارناجـاری دەیگـوت ڕێـم بـدەن مـن هـەر دەمـرم بـا بگەڕێمەوە نێو منداڵـەکانم، دڵـم دەدایـەوە ودەمگـوت ئـەوان ئێستە خۆیـان حەشـارداوەو لـە مردنـەوە دوورن، بـەڵام ئێمـە لـە مەترسـیداین، دەمگـوت دایکـە گیـان بکـەوە ڕێ بـا ڕزگـار بین.ڕاز هاواریکرد گوتی بڵند گیان، بگـەرە هـەڵۆ، زانـیم ئاوە ژەهراوییەکـە

وای لێکرد، چوومە لایەوە، گوتی منیش وەك ئەو خەڵکە کۆتایی بە ژیانم دێت، بڵند ئاگاداری (ڕاز)ی خوشکم بە، دایکی خۆی دایە سەری، زۆر هەوڵمدا لایبەرم بەلاّم سوودی نەبوو، زۆر ویستم هەڵیستێنم و بکەوینەوە ڕێ، بەلاّم کیمیایەکە زۆر کاری لێکردبوو، خەمی کوڕەکەی ئێجگاری کردبوو، بە زۆر لامبرد.هەڵۆ، کەوتە سەر پشت، هەناسەیێ قوڵی هەڵکێشا ، دەستەکانی ڕەقبوون و کەف بە دەمیا دەهاتە خوارێ، چاوەکانی ڕوو لە حەوا بوون وگیانی سپارد، دایکیشی توانای بینینی ئەو دیمەنەی نەبوو ولە تەنیشتیەوە گیانی سپارد، سەدای دەنگی زریکەو هاواری ڕاز، لە نێو شاخوداخ دەنگی دەدایەوە، زۆر بەزەییم پیا هات، قۆڵم خستە نێو قۆڵێ (ڕاز)ەوە، وتم مەرگەساتەو هیچ دەستەلاّت نییە، خەونەکەی تۆیە، گێژاوی لافاوێکەو دەیەوێ هەموومان لووشکات، ئێمەش نۆرەمان دێت، با هەر بڕۆین تا بزانین گێژاوەکە بەرەو کوێمان دەبات، کەوتینەوە ڕێ، چاوەکانم زۆر دەتۆزانەوە، بە خوڕ ئاوی پیادا دەهاتە خوارێ، شەونم زۆر ماندوو ببوو، کیمیایەکە سەروچاوی سووتاندبوو، ئەمجارەیان شەونم کەوت، گوتی، کاکە بڵند دەمرم، زۆر پەرێشانم. گوتم مەترسە ورە بەرمەدە، بەلاّم تەواو سووتا بوو، دوا سەرنجی دام وگوتی ئێوە بڕۆن با ڕزگاربن، با چەقۆی مەرگ پێتان نەگات وخۆشەویستیتان نەخاتە ژێر گڵەوە، دایکم خۆی دایە سەریا و گوتی بە خوا جێتناهێڵم، با پێکەوە بەرەو ڕووی مەرگ بینەوە، ڕووی کردە من و گوتی بڵند کوڕەکەم،

قسەی شەونم زۆر ڕاستە، ئێوە بڕۆن دووربکەونەوە، چاوم زۆر بە لێڵی دەیبینی، تا دەنگ لە گەرووم مابوو هاوارمکرد بۆ خوا وتم تۆ نابینی چیمان لێدەکری؟! بۆ بەزەیی خۆت بەسەرماندا ناباڕێنی، بۆ دوژمنان ناکەیت بە بەرد، بۆچی. . بۆ؟!سەرم داخستەوە ئەو هاوارەم کاری لێکردم وتووشی هەناسە سواری کردم، کاتێ بە تەواوی چاوەکانم کردەوە، شەونم گیانی سپاردبوو، ڕاز لە ژوور سەریەوە بۆی دەگریا، دایکم نوزەیەکی مابوو، هەر بۆیە گوتم ڕازگیان با دایکم لە کۆڵ بکەم، تا کەمێ دووربکەوینەوە، چونکە نزیك بووینەتەوە لە سنوور، بەڵام توانیم چەند مەترێ دایکم بەرم یەکسەر کەوتم، ڕاز تەنگەنە فەسببوو، ئیدی هەرسێکمان لە چاوەڕوانی چەقۆی مەرگدابووین، چاوەکانم بە تەواوی لێڵ ببوون، نەمدەزانی شەوە یا ڕۆژ، ڕاز گوتی تۆ بڕۆ، تو خوا بڕۆ، با نەمانبینی چۆن ماڵاوایی لە ژیان دەکەین، بڕۆ بڵند گیان بڕۆ. گوتم نا. . نا ناڕۆم لە ئێوە زیاتر نیم، منیش پەکم کەوتووە وچاوەکانم نابینێ چۆن بڕۆم.با هەرسێکمان پێکەوە بین، خۆ هەر لێرە دەماننێژن و پێکەوە دەچینە نێو گڵەوە، لە ناکاو گوێم لە دەنگی چەند کەسێبوو بە زمانی فارسی قسەیان دەکرد، دەنگەکە لێم نزیکبووەوە، وتم ئێوە کێن، فریامانکەون، گوێم لێبوو یەکێ بە کوردی گوتی ئەوانە زیندوون، پاشان هاتنە لامانەوە، یەکیان بە کوردی کەوتە قسان، گوتی ئێمە لە ئێرانەوە بۆ فریاکەوتنتان ناردوویانین، چەند ئۆتۆمبیلێکیان هێنا، من ودایکم وڕازیان

سەرخست، چەندین کەسی دیکەی زیندوویان سەرخست، هەر لە نێو ئۆتۆمبیلەکان فریاکەوتنی خێرایان بۆکردین، پاشان بە هەلیکۆپتەری تایبەت بەرەو شارەکانی ئێران بەڕێیان خستین، نەماندەزانی بۆ کوێمان دەبەن ، بەڵام دەمانزانی لەو مەرگە ساتە، لە نێوگێژاوی لافاو ڕزگاربووینە.
چووینە نەخۆشخانە، پرسیم ئێرە کوێیە، گوتیان تارانە.هیوام بۆ ژیان پەیدابووەوە، بەڵام هەر هاوارم لە چاوم دەکرد، دایکم و ڕاز، بە تەواوی تەنگەنەفەسی تەنگی پێهەڵچنیبوون، پاشان ئەوەی چارەسەری لە تاران نەبووایە بە پەلە بۆ وڵاتان دەیاننناردن، منیش یەکێ بووم لەو کەسانەی بۆ دەرەوەی تاران ناردیانم، تا چاوم چاك بێتەوە، ئیدی وا بۆ حەڤدە ساڵ دەچێت، لە ژێر چاودێری پزیشکی ئەم وڵاتەم، کەچی تا ئێستە چارەسەرنەکراوم، هەر دەمەوێ چارەسەر بکرێم، ئەوسا بگەڕێمەوە بۆ شارەکەم.
نیان وئالان فرمێسك لە چاویان قەتیس مابوو، هەر ئاهیان هەڵدەکێشا.ئالان بە کزیەوە گوتی تا ئێستە هەواڵی شارەکەت نازانی؟
– دەزانم کەسوکاری نێو شارمان نەماون، بەڵام هەواڵ دایکم و ڕاز نازانم، بڕیارمداوە تا چاوەکانم چاك نەبێتەوە نەچمەوە.
نیان: ئێستە لە ئێران باشترین دکتۆری چاو هەیە، تەنانەت چاو دەڕوێنن.
وتم چۆن ؟!

ئالان : زۆر کەس هەیە چاوێکی یا گورچیلەیەکی دەفرۆشێ، تۆ گەر پارەت هەبێت بە ئاسانی چاك دەبیتەوە.

– من، تا بڵێی پارەدارم، بەڵام سەرم سوڕماوە چۆن مرۆڤ ئەندامی لەشی دەفرۆشێ؟!

نیان: لەبەر هەژاریی.

– هەژاری وای کردووە، ئەندامی لەشت لە پێناویدا بفرۆشی؟!

ئالان: تەنانەت لە کوردا هەیە ئەندامی لەشی بفرۆشێ، جگە لە کورد، چەندین خەڵکی وڵاتانی هەژاری دی هەیە.

نیان :ئێوە لێرەن ونازانن دەردی نەبوونی وهەژاریی چیی بە خەڵکی کردووە، جگە لە ئاڵۆزیی سیاسی نێو وڵات. (بڕۆوە زۆر ئاساییە، لە تاران چارەسەری چاو زۆر ئاسانە).

– دەبێت بە تاراندا بڕۆمەوە تا بچمە ئەو نەخۆشخانەیەی چارەسەری خەڵکی شارەکەمانی دەکرد، هەر لەوێدا بۆم دەردەکەوێ ئاخۆ دایکم و ڕاز چییان بەسەر هاتووە.

ئالان: دەتوانی پرسیاری چارەسەری چاوەکانیشت بکەیت..

– واتان لێکردووم، هەر بەم نزیکی بەری بەیانە بڕۆم ومامەڵەی ڕۆیشتنەوە تەواوبکەم.

نیان عودەکەی بینی و بۆیە گوتی وا دیارە عود ژەنی؟..

– بەڵێ، زۆرجار دڵتەنگ دەبم (زەردە) بە پەلە دەچێت بۆم دێنێ تا عودەکە بژەنم، گەر حەز دەکەن و بە ئەرك نابێ بیهێنە با چەند ئاوازێکی ڕەسەنتان بۆ لێدەم.

کەوتە نێو ئاوازە ڕەسەنەکان، کاتژمێرێ تەواو عودی بۆ ژەنین. وتیان بەڕاستی نوێ بووینەوە، دڵودەروونمان بەم ئاوازانە ڕوون بووەوە، با زیاتر ماندووت نەکەین ، زۆر درەنگی کرد با بنووین تا بەیانی زوو بە ئاگا بێین.

– زۆر ڕاستە، من داوای لێبووردندەکەم، بەڵام زۆر لە مێژە چاوەڕوانی دانیشتنێکم لەگەڵ هاوزمانی خۆم، تۆ شەوت شاد و برۆ لە ژووری من بنوو، من وئالان گەر خەو یەخەمانی گرت ئەوا هەر لێرە دەنووین.ئەو شەو شادی کردو ڕۆیشت، بڵند و ئالان، هەر لە شوێنی خۆیان ڕاکشان وبە دەم قسەو باسەوە خەو بردیانیەوە. دوو ڕۆژ لای مانەوە، پاشان ئەوان ڕۆیشتن.دڵەڕاوکێکەی جارانی تووش بوەوە ودیسانەوە لە بەر خۆیەوە دەیگوت نا. نا. نا. وا چاکە ئەوەندە چاوەڕوان بوومە ماوەیەکی دیکەش چاوەڕوان بم. هاتبووە سەر ئەو بڕوایەی وەك خەڵکانی ئەو دەڤەرە داوا لە بەردی پیرۆز بکات تا هاوکاری بکات لە چاکبوونەوەی چاوەکانی، لە هێنانەدی ئاواتەکانی، هەر لەو ڕۆژەوەی ئەو بڕیارەی دابوو، زوو زوو دەچوو بۆ کەناری دەریا، بانگی زەردەی دەکرد، زەردە تێدەگەیشت بۆ کەناری دەریایە نەك بۆ وێستگەی میترۆکان.کە بە زەردەی دەگوت بۆ دەریا، پەتەکەی ملی دەدا بە دەستییەوە وگۆچانە تایبەتەکەی پێدەدا وبە جووتە بەو شەوە، نزیك چارەك کاتژمێرێ بەرەو کەنار ڕێیان دەکرد، بێئەوەی بە زەردە بڵێتەوە یەکسەر لای بەردی پیرۆز دەوەستا،

هێند هاتبوو هەنگاو بە هەنگاو دەیزانی چەندێ ماوە بیگاتێ، لەگەڵ نزیکبوونەوەی، خۆشییەك، تەزوویەكی خۆشی سەراپای جەستەی دەگرتەوە، زیاتر هەستی بەو خۆشیانە دەكرد كاتێ دەستی لەسەر بەردی پیرۆز دادەنا، چەند جارێ دەستی پیا دەخشاند وبە چاوەكانیا دەیهێنا و دەیگوت( ئەی بەردی پیرۆز من زۆر باوەڕم پێتە، گەر هیواكەم بێنیتە دی، نەك تەنیا لە وڵاتەكەی خۆم بەڵكو وڵات بە وڵاتی جیهان دەكەم وسەرگوزشتەكەی خۆمیان پێڕادەگەیەنم، دڵنیابە، وات لێدەكەم پیرۆزیت بگاتە هەموو جیهان). هاتنی بڵند بۆ لای بەردی پیرۆز ببووە نەریتێك گەر نەهاتبایە وایدەزانی ئەو ڕۆژە كارێكی زۆر گرنگی لە دەستچووە، ئەم هاتنانە وبێئەنجامی هاتنەكانی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دڵی پڕدەبوو وگریانی غوربەتی ونائومێدی قوڕگی دەگرت، گەرهەستی بكردبایە كەس لە نزیكی ئەو دەڤەرە نییە بە كوڵ دەگریا، گریانێكی بە دەنگ، دەنگێكی پڕ لە نائومێدیی، فرمێسكێك دەهاتە خوارێ كەس باوەڕی نەدەكرد لە چاوێكی نابیناوە ئەو فرمێسكە گەشانە وەك دڵۆپی بارانی بەهار گەش دەچوونەوە، وەك ئاورینگی بەیانی سەر پەڕەی گوڵێ وابوو، چونكە لە دڵێ پاكەوەبوو، دەیویست چەند وشەیەك بەرانبەر بە بەردی پیرۆز دەربڕێ، بەڵام نەیدەتوانی، تا بە تەواوی بەو فرمێسكانە دڵوناخی دەشوشتەوە ئەوسا بەسەرهاتی بۆ بەردی پیرۆز دەگێڕایەوە، لە نووكەوە

بەسەرهاتەکانی نیشتمانەکەی بۆ باس دەکرد، وەڵامی لە لایەن بەردی پیرۆزەوە نەدەدرایەوە.
ڕۆژێك زۆر تینی بۆ هات، توڕەبوون وکینەیێ توند ناخیان گرتبوو، ناچاری کرد بڵێت (ئەی بەردی پیرۆز، تۆ زۆر ئیشت بۆ خەڵکی ئەنجام داوە، کەس نەهاتووە وبێئومێدت کردبێ، پێمناڵێی بۆ وەڵامی من نادەیتەوە، تۆ زۆر بە توانایت، تۆ بۆ پاراستنی خۆت کەسێکت وەك پەیکەرێ لای خۆتەوە بەندکردووە، نە خۆری گەرم دەتوانێ بتتوێنێتەوە، ئەی بێچووی چیای بەفرین، تۆ وەك مرواری ویاقوت بە نرخی، ئەوسا کەس نەیتوانیووە لە بەژن وبالآت کەم بکاتەوە، نازانم تۆ ڕێزی غەریبان ناگری، مرۆڤی لێقەوماوت ناویێ؟! لەوڕۆوە بەڵێندەدەم ئیدی نایەم بۆ لات وسەرگوزشتەکانمت بۆ ناگێڕمەوە، دوا جێژوان ودیدارمە ئەی بەردی پیرۆز ئەی بێچووی چیای بەفرین.
دەستی بە بەردەکەدا هێنا بە تەواوی تەڕببوو، بۆ یەکەمجاربوو دەستی تەڕ بکات ولەگەڵیدا تەزوویەك بە جەستەدا تێپەڕی ودەمارەکان چاوی بووروژێنێ، شەپۆلەکانی دەریا شێتگیربوون ودەچوونە ئاسمان و وەکو باران دەهاتنەوە خوارێ، هاژەی شەپۆلەکان هێندە نەبوو وشە دروست بکەن وبکەونە قسە، زەردە دەنوزایەوە، هیچ کات بڵند بەو شێوەیە گوییێ لە نووزەی نەببوو، پەتەکەی خستە نێو دەستی بڵند، ئەویش ترس پاڵی پێوەدەنا بڕوات نەك ڕۆیشتنێکی ئاسایی، تا دەتوانێ بە ڕاکردن ئەو شوێنە

جێبێڵێ، کە پریشکی شەپۆلەکانی دەریا پێیان گەیشت، ترسا وەك مافیاکانی لێبکات، لە دڵی خۆیدا گوتی وا دیارە توورەبوونیش لە هیچ کەس قبوڵ ناکات، بە پەلە دەڕۆیشتن، بەڵام دەنگی شەپۆلەکان هەر دەهات تا وای لێهات تێکەڵ دەنگێکی نامۆ بوو، کە زۆر هەستی ڕاگرت، دەنگی دوو دۆڵفینە سپییەکە بوو، لەگەڵ شەپۆلەکانی دەریا ڕووەو ئاسمان تەواو بەرزدەبوونەوە، شڵپەی دۆڵفینەکان بە خۆ کوتانە سکی دەریاوە دەنگی دەدایەوە. ئەمانیش هەنگاوەکانیان خێراتر دەهاوێشت، تا بە تەواوی دوورکەوتنەوە، گەیشتنەوە ماڵ، هەناسە بڕکێیان پێکەوتبوو، پاش پشوودانێك، ئەو دیمەن و دەنگانەی لە یادناچوو، ڕەنگ پەڕیوی و ترسی پێوە دیاربوو، تا درەنگ نەیتوانی بنوێ، سەری نایە سەر سەرینیش خەیاڵ وازی لێنەدەهێنا، پاشان خەو هێدی هێدی لێشاوی بۆ هێنا.( پیاوێ نورانی بە ساڵاچوو، بە ساڵاچویەکی زۆر

پاك، سپی پۆش، لە تەوقی سەریەوە تا پێیشی دیار نەبوو بەو کراسە ئاوریشمییە سپییە کە باڵابەرزییەکەی ڕێکتر کردبوو، ڕیشی سپی درێژ ونەرم، قژە خاوەکەی گەیشتبووە سەرشانی، ویقاریان پێبەخشیبوو.بزەیەك، میوانی هەمیشەیی سەر لێوانیبوون، ببوونە جێدڵنیایی و ڕەوینەوەی ترسەکەی.شنە بایەك کراس و ڕیش و قژەکەی دەهێنا ودەبرد، وێنەی شەپۆلەکانی دەریا لە کاتی ئارامییانی وێنا دەکرد.یەکسەر گوتی بۆ ترسای،

ئەوڕۆ بۆ ترسای، من ئەوڕۆ ویستم داواکاریت بێنمەدی، دەستی برد بۆ تەوقەکردن ، ئەو دەستە نەرمە، بە ڕواڵەت دەستی مرۆڤ و وەکو دیکەش زۆر جیاوازتر، تەزووی بە جەستەیدا هێنا وگوتی یەکەم جارمە فرمێسك بڕێژم، تا ئەوڕۆ هیچ شتێك کاری تێنەکردووم هێندەی بەسەرهاتەکەی ئێوە، هێندەی ئەو کارەساتە نامرۆڤانە و جەرگبڕە، دۆڵفینەکانیش بۆیان گێڕامەوە.دەستی لە نێو دەستی دەرهێنا چەند هەنگاوێ پاشە وپاش گەڕایەوە، گوتی سبەی شەو وەرەوە ومیوانداریم بکە، ئەمجارە هەرچیی بوو مەترسە، سەگەکەشیت بیر نەچێ، گەر هاتی تا دەتوانی سەرنجم بدە، هاوێنەیەك دەبینی، لە پڕدا چاوەکانت دەکرێنەوە، لەو هاوێنەیەوە سەرنج بدە وەك ئەوەی وێنەگری کامێرایەك بیت، چیتان بەسەرهاتووە پێکەوە تەماشای دەکەین. بزانین دوو دۆڵفینەکە چییان لە سینگدا هەڵگرتووە، چونکە ئەوان هەواڵی دونیای مرۆڤەکان وگیانداران وتەنانەت چیی زیندەوەرانی سەر ڕووی ئەم زەمینە هەیە ئەوان دەیزانن، ئەوان باوکودایکی هەموو دۆڵفینەکانن، وەك چۆن ئادەم وحەوا دایك وباوکی ئێوەی مرۆڤە.چەند هەنگاوێ دیکە کشایە دواوە پاشان بە زەردەخەنەوە دەستی بەرزکردەوە ودوا وتەی.....(سبەی شەو وەرە ونەترسی، لە هیچ. . لە هەڕووداوێك کە ڕووبدا لە کەنار، نەترسی. . لە هیچ نەترسی، ، لە هیچ) ، ونبوو لە چاوان، بەڵام ئارامی وهێوور

بوونـەوەی دڵـی بـە بینینی ئەو خەونـە وایکرد بـە ئاگا نـەیـەت، تـا بەیانی لە دەستلەملانێی خەوێکی هێمندا بوو.
هەستا، زۆر ئارام، دڵخۆش، زەردە هات وکەوتە لێستنەوەی.زەردە ترسەکەی شەوی کەناری دەریای پێوەدیار نەبوو، لـە دڵـی خۆیـدا گوتی، (باسی زەردەی کرد بیبەم لەگەڵ خۆم، لەوانەیە چووبێتەوە خەوی ئەویشەوە)، زیاتر بۆی ڕوونبووەوە، کە شەوێ زەردە خـۆی ئامادەکردەوە وپەتەکەی دایە دەستی، کە پرسی بۆ کوێ؟
چـەند نوزەیـەکی لێـوە هـات، کـە پێگرانـی کـرد، وەك یـەکێ تـووڕە چەند جارێ وەڕی..
ئەلەند گوتی بەرەو کەنار بچین؟
یەکسەر دەستی لێستەوە وڕازیبوونی خۆی پێشاندا.
بێئـەوەی سەریسوڕبمێنێ لـەم هەڵسوکەوتەی زەردە، سـەدای ئـەو دەنگـــەی لـــە ژوورەکانـــدا مـــابووەوە، هـــەر لـــە شـــەوێوە بـــۆی جێهێشـــتبوو، (ســـبەی شـــەو وەرەو نەترســـی، لـــە هـــیچ. لـــە هەررووداوێك کە ڕوویدا لە کەنار، نەترسی). لـە دڵـی خۆیـدا گـوتی خـۆی وا بـانگم دەکـات.ڕوویکـردە سـەگەکەی گـوتی زەردە گیـان دەزانی خۆی بانگمان دەکات، زەردە زۆرجوان تێگەیبوو، پەلەی لە بڵند دەکرد بۆ ڕۆیشتن، ملی ڕێیان گرت، بەرەو کەنار بەرێکەوتن.
(کەوتـە خەیاڵـەوە، لەبەرخۆیـەوە دەیگـوت، دەبێـت هـەر ئێسـتە چاوەکانم چاکببنەوە؟ جارێکی دیکە ڕووناکی قووتبدەم وبۆ تـا هەتایـە نەیهێنمـەوە؟ئاخۆ دەبێت پیرۆزی ئـەم بـەردە ڕووناکییـەکی

هەمیشەیی لە نێو چاوەکانم بکاتەوە؟دەبێت بچمەوە شارەکەم وبە کەسەکانم شادبمەوە؟ڕاز ببینمەوە، هەروەکو جاران، جلەکوردییە ئاوریشمییە مۆرەکەی بەسەر شانو سەراپایدا شۆڕ بووبێتەوە و بالأبەرزییەکەی بنەخشاندایە، قژێکی خاو، وەك شەپۆلی دەریا، وەك ئەوەی هەمیشە شنەبایەك لە خزمەتیابێت وباوەشێنی بکات بیجولێنێتەوە بەسەر شانومل ودووبەیدا خۆی شۆڕ کردبێتەوە؟ ملپێچە پەمەییەکەی لە ڕەنگ و ڕوخسارە سپیەکەیدا پەمەییەکی کالی لەسەر ڕوومەتەکانی وێناکردبێت؟چاوە قاوەییە کالە گەشەکەی، ئەو چاوەی وەك هاوڕێیەکی هەمیشەیی لێوەکانی، زەردەخەنەیان لێدەباری، خەندەیان بۆبکردمایە؟بمبینیایە. .بەم چاوانەم. . بمبینیایە؟!)..

دەنگوهاژەی شەپۆلەکان لەو خەیالەیان پساند، بەلأم هێند تامەزرۆی خەیالەکانی بوو، ترسی لە گیان وڕوخساریدا نەهێشتبوو، زەردە بە پێچەوانەی دوێنێوە پەلەی بوو تا بگەنە لای بەردی پیرۆز.گۆچانە تایبەتەکەی دەستی کە لە هەر شتێکی بدایە زەنگی ئاگادارکردنەوەی بۆ بلند لێدەدا، هەر گەیشتنە نزیکی بەردی پیرۆز و سەری گۆچانەکە لە بەردەکەیدا، زەنگی بۆ لێدا وئاگاداری کردەوە، زۆر بەڕێزەوە، خۆی نوشتانەوەو ماچی بەردی پیرۆزی کرد، وا هەستی دەکرد بەردی پیرۆز دەستی هێناوەتە پێشەوەو ئەمیش ماچی دەکات، لای ئەم، بەردی پیرۆز، پیاوە نورانییەکەی شەوبوو کە خەونی پێوە بینی.

دیسانەوە شەپۆلەکان شێتگیر بوونەوە، ئارامی دەریا نەما، موچڕکیش بە جەستەیدا هامووشۆی بوو، لێشاوێ بوو، نەیدەزانی ترسە یا خۆشییەك لەگەڵ خۆیدا بەرەو ناخی دەبات وهیوای چاك بوونەوەی چاوی وبینینەوەی شارەکەی وکەسەکانی بۆ دێنێ.

کە زەردە کەوتە نوزە نوز و یەکسەر دەنگی لە خۆی بڕی، زانی دوو دۆڵفینەکەی بینیووە، لەگەڵ شەپۆلەکان یارییان دەکرد، خۆزگەی دەخواست بیانیبینیایە.

بۆ ئێستێك هەستی ڕاگرت، سەری سووڕما، لە پڕێکدا دەریا ئارام بووەوە، وەك ئەوەی پێش کەمێك شەپۆلەکانی بە حەوادا نەچووبن وابوو، خۆیشی لێشاوی تەزوو لە لە شیدا ئارام وخامۆش بووەوە، ئارامییەك مژدەبەخشی پێوە دیاربوو، ئارامیێ تا ئەو ساتە بۆ حەڤدە ساڵ دەچوو، بە خۆیەوە نەیبینیبوو، دڵیشی ببووە چاو بەرانبەر بەردی پیرۆز وەستابوو تەماشایدەکرد، ئەوەی نەیبینیبوو لە ژیانە ئەو ساتە بوو، لێدانی دڵی هیچ کات بەوشێوەیە لێی نەدابوو، وەك یەکێ نەشتەرگەری چاوی کرابێ و لە چاوەڕوانی مژدەیەکی خۆشی دکتۆرەکەیدا بێت، هەستیکرد ڕووناکییەك وا خەریکە تاریکی پێشچاوی لا دەبا، (ڕووناکیێ بە تاریکی دەڵێت بڕۆو واز لەم غەریبە بێنە و بڕۆ. . بڕۆ، تا سەرچاوی دڕندەی مرۆڤ ومرۆڤایەتی مەوەستە، ڕەشماڵی ڕەش لە سەرچاوانیان هەڵبدە، بڕۆو تۆڵەی خۆتیان لێبکەرەوە، کە تۆیان بە کەسانی بێتاوان و

مـرۆڤ دۆسـت سـپاردووە، بـە ڕەشمـاڵی ڕەشـیان ئاسمـانی شـین ودیمەنی سروشتی جیهان لـە مرۆڤ دەشارنەوە)، ڕووناکی کۆچـی بـە تـاریکی کـرد، وردە وردە بـەردی پـیرۆز دەرکـەوت، بـاوەڕی نەدەکرد ئەمە ئەوە و بە چاوانی، بەڵێ بە هـەردوو چاوی خۆی پیرۆزتـرین شـتێك لـە دونیـا دەبـینێ، ئێسـتێك هەسـتی لـە خـۆی ڕاگـرت وئاگـایی خسـتەوە کـارو بـۆی دەرکـەوت خـەون نییـە، دەستەکانی دەلەرزین، (وەك یەکێکی ئاشق لە ناکاو ئەوەی ئەشقی بـووە ببیـنێ، نـەك تـەنیا دەسـتی، دڵیشـی دەلـەرزێنێ)، ئـەمیش ئەشقی بینین وتامەزرۆیی ڕۆژێکی وابوو، گۆچانەکەی دەسـتی کـە تا ئەو ساتە نەیزانی چ گۆچانێکە (قاوەیی، قاوەییەکی بریقەدار، لە سەریشی شوێنێکی تایبەت بۆ زەنگ لێدان لە کاتی پێدادانی بە شتێکدا)، کەوتە سەر زەوی، حەزی کرد هەڵینەگرێتەوە، تەماشـای بـەردی پـیرۆزی کـرد وسـەری دانوانـد وچـەند جـارێ ماچـی کـرد، بەڕێزەوە دوو هـەنگاوێ هاتـە دوواوە، تەماشای بەردەکەی دەکـرد ئـەڵماس ئاسـا، تـا دەهـات دەدرەوشـایەوە، ڕووناکییەکـەی ئـەو دەڤەرەی کردبووە چراخان، سەراپا جەستەی بڵند ئەدرەوشایەوە، تـا ئـەو کاتـە نەیـدەزانی زەردە ڕەنگـو ڕوخسـاری هێنـد جوانـە، (تـوکێکی زەرد، پڕونـەرم، بـە جەسـتەیدا شـۆڕبۆتەوە، دەوری ملیشی وەك ملپێچێکی سپی، بەو توکە نەرم ودرێژەی جوانییـەکی بێوێنـەی دابـووە سەروچاوە خـڕو خڕپنەکـەی، وێنـەی شـێرێکی گـەنجی پـێ بەخشـیبوو، ئـەو ڕووناکییـە چـاوە هەنگوینییەکـەی

دەبریسکاندەوە، توکەکانی وەك ئاڵتوون دەدرەوشانەوە، کلکیشی لای خوارەوەی سپی تا نیوە، لەوێوە بۆ سەرەوە زەرد دەچووەوە، گەر بە ڕەنگی تایبەت ونیگارکێشی تایبەت بەو کارە هەستێ ئەو جوانییەی پێنابەخشی).

تەماشای بەردی پیرۆزی زۆر کرد، لە ناوەڕاستییەوە هاوێنەیەکی کامێرا ئاسا، بەڵام زۆر گەورەتر، بەدیکرد، ڕاسپاردەی خەونەکەی بیرهاتەوە، بۆیە چاوی نەپروکاند، لە پڕدا لە هاوێنەکەوە، لە سەر ڕووی دەریا، دوودۆڵفینەکەی بینی، هەردووکیان پێکەوە بە وەستاوی، سینگیان دەرپەڕاندبوو، تەماشای کرد، وەك شاشەیەکی سینەمایی، سەرەتا دیمەنی لوتکەی چیایەك لە سەر سینگیان دەرکەوت، وردە وردە هاتە خوارێ پێدەشتێکی پان وبەرین وڕازەوە بە گوڵاڵە سوورەو نێرگز، دامێنی چیاکەی نەخشاندبوو، گەیشتە نێو ڕەز و باخی شار، دار هەنارەکان، گەڵای سەوزیان لە بەهار دزیبوو، خۆیان ئامادەدەکرد بۆ بەهارێ تا تۆڵەی ئەو بەهارە ڕەشە بکاتەوە، کە دڕندەکان بە ڕەشماڵی ڕەشیان سەوزیان ڕەشکرد، بە بارانی ژەهراوی کانیاوەکانیان پیسکرد، ژنومنداڵوپیرو پەککەوتو لاوانیان سوتاند، شاریان کرد بە خۆڵەمێش، بۆکڕووزی تووکوپەڕی باڵندەکان، هیوایان نەهیشت بۆ ژیان، هەمووان لەوێدا بارکران، گواسترانەوە، بۆ ناخی زەوی، بۆ شاری دیکەی ئاسمان)، ئەو دیمەنانە لە مێژبوو، لە سینەی دۆڵفیندا هەرمابوو، لە پڕدا فیلمێکی دیکە، دیمەنێکی دڵتەزێن،

خـۆی تیـا بـینی چـۆن دەیـەوێ ڕزگاربێـت، چـۆن دەیەویسـت کەسـەکانی لـەو ژەهرباریـنـە ڕزگـار بکـات، کـەس لـە ڤایرۆسـی ئەنفلـەوەنزای ژەهـر دەربـاز نـەدەبوو، ئاوی چاوی دەکردە تێزاب وڕووناکی چاوەکانی دەدزی، هەوای دەکردە گڕێك ئاگر وهەناوی پێدەسوتان، تـا لـە پاڵێکدا، لـە ژێـر زەمینێکدا، لـە کـەنار ئـاوی چەمێکدا، بە کۆمەڵ دەستلەملانێی یەکتردەبوون، ڕوویان لە خوای خۆیـان دەکـرد، سـکاڵای ئـەم زوڵمـەیان پێشـکەش بارەگـای خـوا دەکـرد، بـینی چـۆن فڕۆکـە بـە دوای یەکدیـدا دێـن و ڤایرۆسـی ئەنفلـەوەنزای ژەهـر بەسـەر خـەڵکی، خـاك، ئـاو، باڵنـدەو ئـاژەڵ، ڕووەکەکاندا دەکەن، چۆن دارو دیـوار دەکـەن بە خۆڵـەمێش، چۆن فڕۆکەکان کاغەزی سپی، ئەو سپییەی هەمیشە نیشانەی ئاشتییە، ئـەو دڕندانـە، ئاراسـتەی هـەوایان پێـوەردەگرت تـا بتـوانن زوو ڤایرۆسەکە بگەیەننە هەناوی منداڵێکی ساوا، دایکێکی دوو گیان، پیرێـك کـە بـە گۆچـانەکەی هەوڵـدەدا بـۆ دەربـازبوون لـەو پـەتای ئەنفلەوەنزایــە، کــۆترێکی ســپی، ئیجگــار ســپی، بــەرخێکی بەستەزمان، هـەناری باخـەکان هـەموو هەڵدەقرچـان، خـۆی بـینی چـۆن بـۆ دایکـی هـاواری دەکـرد، بـۆ خوشـکی بـۆ ڕاز ئـەو ڕازەی حەڤدە ساڵە لـە پێناویـدا نـاتوانێ بڕواتـەوە، دەیـەوێ چـاوەکانی چاکبنەوە ئەوسا بچێتەوە.وێڕای ئەو هەموو کارەساتانە، پیرۆزی ئەشـق وخۆشەویسـتی ڕێیـان پێگرتبـوو، نەیاندەهێشـت هـەنگاو بنێت و بچێتەوە باوەشی نیشتیمان، پاشئەوەی خۆی بینی چۆن

لـه دوا سـاتدا بێئومێـدبوو لـه ژیـان ولـه تەنیشـت ڕاز ودایکیـەوە، ڕوویان کردبووە یەکدی، لەگەڵ لێشاوی ئازارەکان، ئەوان، هێشتا هـەر بۆ یـەك ئـەدوان. کۆمـەڵێك ڕیشـدار هـاتن بـۆ لایـان، باوەڕیـان نـەدەکرد، تـا بـە تـەواوی لـە شـوێنی پەتاکـە ڕزگـارکران.فرمێسـك نەیـدەتوانی بـە قەتیسـماوی بمێنێتـەوە، وشـەکان لەسـەر زوبـان خۆیان نـەدەگرت وئـەدوان، هاواریانـدەکرد، دایکـە گیـان، ڕازەکـەم، خوشـکوبراو کەسـوکار، بـاخی سـووتاوی بـەجێماو، بـۆ.. بۆچـی چیمان کردبوو؟! ئێمەش مرۆڤ بووین، زۆر مرۆڤ دۆستیش بووین، بۆچـی.خـوا گیـان بۆچـی؟ دوا دیمـەن تـەواوبوو.لـە پـڕ دۆڵفینـەکان هەر لە جێی خۆیان، خۆیان نوقم کرد و بزربوون، بەردی پیرۆز بە خوڕ ئاوی لێدەچۆڕا، ترسا ئەویش جێیبێڵێ، هەر بۆیە گوتی ئـەی بـەردی پـیرۆز، نەکـەی جـێم بێڵـی، نامـەوێ لێـرە بـڕۆی، خـۆت مەتاوێنەوە، دەزانم تۆش کارەساتی شارەکەم کاری تێکردی.زەردە یەکدووجارێ وەڕی، وەڕینێکی زۆر سەیر، کە ئاوڕیدایەوە، ڕوو لە ئاسمـانبوو، ئیلوورانـدن هـەروەك لـوورەی گـورگ، دوو فرمێسـکی گـەش وەك ئـاورینگ بـە نێـو توکەکانیـەوە. ئـەمجارەیان تەماشـای بـەردی پـیرۆزی کـردەوە، لەگـەڵ کەمبوونـەوەی ڕوونـاکی بـەردی پیرۆز ئەمیش پێشچاوی ڕووناکی کەمدەبووەوە، دەستی بۆ بەردی پیرۆز برد وتکـای کـرد، تـاریکی پێنەبەخشێتەوە، زۆر تکـای کـرد، لەبـەر ئاشـقێتی خـۆی وپـیرۆزی منـداڵی سـاوای شـارەکەی، باڵنـدەکان، چـیاکانی دەوروبـەری شـار، هەمیشـە دووبـارەی

دەکـردەوەو دەیگـوت تـۆ بێچـووی چـیای بـەفرینی، تـۆ هـاوڕێ وکەسـی هـەموو چـیاکانی سـەر زەمـینی، لەبـەر پـیرۆزی ئەوانـە تاریکیم پێمەبەخشەوە، بەڵام بەردی پیرۆز لەگەڵ قسەکانی ئەودا پتر دەتوایەوە ورووناکی پێنەماو ئەمیش کەوتە سەرچۆك وسـەری بـە تـەواوی دانوانـد وبـە کـوڵ دەگریـا، گریانێـك دەریـای بێـدەنگ وئـارام کردبـوو، شـەپۆلەکان هەڵنەدەچـوون، وەك ئـەوەی لـە پرسـەیەکدا وەسـتابن، زەردە کەوتـە لێسـتنەوەی، پاشـان گوچانەکەی بە دەمـی هەڵگرتـەوەو دایـە دەسـتی وپەتەکـەی خسـتە نێـو دەسـتەکەی دیکـەی وگەڕانـەوە بـەرەو مـاڵ، لەگـەڵ هـەر چـەند هـەنگاوێك ئـاوڕی لـە بـەردی پیرۆز دەدایـەوە، ئـاوڕێ، لـە دیـدێکی تاریکییـەوە بـۆ شـوێنێکی تاریـك. تـا بـە تـەواوی بە ئاگـا نەهاتـەوە نەیدەزانی بۆ وا دەستەکانی دەلەرزن، هەسـتی بـە سـەرمایەکی زۆر کـرد، لـەرزین گەیشـتە جەسـتەی، نزیـك مـاڵ بـووەوە، هێنـدەی نـەمابوو بکـەوێت، گەیشـتە ژوورەوە، چـایەکی گـەرمی خـواردەوە، زەردە ژوورەکەی ئەوی جێناهێشت، پێیدەگوت بڕۆ بۆ ژوورەکـەت پشوو بدە، بە قسەی نەدەکرد. سێ ڕۆژ لەسـەر جێگـە بـۆی کـەوت، دکتـۆری بـۆ پشـکنینی خـۆی بـانگ کـرد، دکتـۆری ڤێتەرنـەری بـۆ زەردە، پێیگـوت تـۆ نەخۆشـییەکی وات نییـە تـا چارەسـەرت بـۆ دانـێم، بـەڵام پێویسـتت بـە پشـووە، بـۆ زەردە، دکتـۆری ڤێتەرنەریەکەیش هەمان شتی بۆ زەردەش پێگوت.

پاش سێ ڕۆژەکە، لە چوارەم ڕۆژدا، ئارامیێ باڵی کێشابووە سەریان، ئەو شەوە هەستی کرد، هەستی تەواوی لە تەندروستی خۆی ڕاگرت، ئاگایی تەواوی کردەکار، تەنیا چاوەکانی کاری خۆیان نەدەکرد، ئەگینا لە نووکی پەنجەوەی تا تەوقی سەری بێئازار، ئارامی دەروونیشی لە خۆگرتبوو، هیچ کات ئەو هەستەی لا دروست نەببوو، سەگەکەی وەکو ئەو، ئەو سێ ڕۆژە کزوبێدەنگ، بەلاّم هەر لە ژوورەکەی بڵندا هەڵتووتابوو، هەردووکیان کاریگەری ئەو دیمەنەی کەناری دەریایان پێوە دیاربوو، بەلاّم ئەو خامۆشییە نەك بەسەر هەر هەردووکیان، تەنانەت دارەکانی نێو باخەکەیان، گوڵەکانی نێو ئینجانەکان، عودە هەڵواسراوەکەی، گۆچانە زەنگوڵدارەکەی، پێکڕا هێمن وئارامی داپۆشیبوون، باڵی کێشابوو بەسەر هەموو شتێکی ئەو خانووە خنجیلانەیە.دەیویست بە زەردە بلێ بەرەو کەناری دەریا بچنەوە، ئارەزووی بینینەوەی دیمەنەکانی دەکرد، بەلاّم هێزێکی نادیار، دەنگیێ لە غەیبەوە چرپاندییە بنگوێی وپێیدەوت(مەچۆ ئەم شەو مەچۆ).وای لێهاتبوو باوەڕێکی زۆری بە کارە غەیبییەکان، نامۆکان، ئەوانەی زۆر کەس گاڵتەی پێدەکەن ئەم باوەڕی تەواوی پێهەبوو، هەربۆیە ئەو شەوە، نەڕۆیشت.خەوی پاڵەوان باوەشی بۆی کردەوەو زۆر بە ئاسپایی وەك منداڵێکی ساوا لە ئامێزی گەرمیا نواندی.میوانێکی خۆشەویستی لە ژوور سەریەوە وەستابوو، بە دەستە نەرمەکانی، نەرمێکی بێئێسك وەك

لۆکە، سەری شێلا، دەستی بە سەروچاویدا هێنا، پاشان کەوتە شێلانی تەواوی لەشی، لەگەڵ هەر شێلانێ ئازارەکانی جەستەی خۆیان کۆدەکردەوە ومالاوایییان لێدەکرد، پێیگوت، (چەندین ساڵە لە کەناری دەریام، هیچ شتێ کاری تێنەکردووم، نە خۆری گەرم، نە مافیاکانی شار، نە شەپۆلەکانی دەریا، نە دڕندەی نێو دەریا)، بەلاّم دیمەنی ئەو کارەساتە دڵتەزێنەی بەسەرشارەکەتان هات ولە سینگی دۆڵفینەکان چەندین ساڵە پارێزراون، بینیم، فرمێسکی لە سەراپای جەستەمدا هێنایە خوارەوە، تەمەنی چەندین ساڵ کورت کردمەوە.بڵند گوتی چەند ڕۆژە بە بینینی ئەو دیمەنانە، سەرم سوڕماوە لە تۆو دوو دۆڵفینە سپییەکە.دەستی بە ڕیشە سپییەکەیدا هێنا، زەردەخەنەیەك ئابلۆقەی لێوانیدابوو وگوتی ئەو دوو دۆڵفینە وەك ئەنتەرنێت کار دەکەن، هەموو جیهان، بە دیمەنەکانەوە، بە کارەساتە دڵتەزێنەکانی سەر هەر کونوقوژبنێکی ڕووی زەوی لە سینگیاندایە، ئەوانیش لە چیای بەفرینن، سالاّنێك لە نێو سکی چیای بەفرین بوون، ڕۆژگار باوە گەورەی توانینەوە، تەنیا من و ئەو دووانەی لە پاش بە جێماین، هەر سێکمان بە کارەساتی ئێوە دڵتەنگین، ئەوان بە ئارامی چوونەوە نێو قولاّیی دەریا، منیش تا ئێوە دوورکەوتنەوە لە فرمێسك ڕژان نەکەوتم، لە بەیانیەوە لاتانم، تا ئەوڕۆ بۆ هیچ شوێن نەچوومە، ئەمە یەکەمین جارە سەردانی مرۆڤێك دەکەم، خۆمن بۆ هەموو مرۆڤەکان بە پەرۆش بوومە، ئەوەی پێویستی بە من بێت هاوکاری بوومە، بەلاّم

ئەوەی ئێوە جیاوازە، من بە جێتدێڵم، خۆتیش ماندوو مەکە زیاتر ئـەو دیمەنانـەی دۆڵفینـەکان پێشـانیانداى، نایبینیتـەوە، بـەڵام مژدەیەکت پێدەدەم( ڕۆژێك دەگەڕێیتەوە بۆ شارەکەت. هیواکانت دێتـەدی، دیسـانەوە دێیتـەوە بـۆ ئـەم شـارە، مـن تـا ئـەو کاتـە چاوەڕوانتم، لە شوێنێکدا یەکتر دەبینینەوە، یەکتر دەبینینەوە. .
.) دەسـتی بـەرزکردەوە، ڕایدەواشـاند ومـاڵاوایی کـرد، سـەری دانوانـد وبـە بـزە بـە سـۆزەکەی، بـەو بزەیـەی پـاش چـەندین سـاڵ هـەمان زەردەخەنـەی بـۆ بڵنـد کـردەوە، نـەك لەسـەر زەوی زۆر لـە بەرزی، لە نێو هەور لە نزیك مانگوئەستێران.
ئەوەی خستییە نێو خەیاڵی ڕۆیشتنەوە (نیان وئالان)بوو، بەڵام ئـەوەی لـەوان زیـاتر کـاری لێکردبـوو جێسـەرنجی بـوو، ڕۆژێکـی لێکردبـووە یـەك سـاڵ بـۆ تـەواوکردنی مامەڵـەی ڕۆیشـتنەوەی، (بەردی پیرۆز) بوو، هیوایەکی بێئەندازەی پێبەخشی، دوای یەك ڕۆژ پـاش ئـەو خەوبینینـە بـە بـەردی پـیرۆزەوە، دەسـتی بـە ئامادەکاری گەڕانەوە بۆ کوردستان کرد.پاشئەوەی چوو ماڵاوایی لـە بـەردی پـیرۆز کـرد وپەیوەنـدی بـە (نیـان وئـالان)ەوە کـرد وسوپاسیکردن، بە لەبەرکردنی ئەو قاتەی (تەمەنی حەڤدەساڵە وکۆمەڵێ یادی لە خۆگرتووە)، لە شانکردنی عودەکەی، لەگەڵ زەردەی هـاوڕێی پـاش چـەند کاتـژمێرێ گەیشـتنە تـاران. پێشوازیکارانی نێو فڕۆکەخانەکە زۆر ڕێزیان لێگرت، تا دەرەوەی فڕۆکەخانەکـە لەگـەڵیا چـوون، شـوفێرانی خـاوەن تاکسـی نزیـك

دەکەوتنەوە، بانگیان دەکرد تا سەرنشینیان بە چنگ بکەویّ، بە دەنگێکی بەرز گوتی براینە کیّ لەم تاکسیانە کوردە؟ شوفێرێکی کورد گوتی فەرموو برای بەڕێز، من کوردم، لە خزمەتدام، نۆکەرتم، چییتدەویّ دەیخەمە سەرچاو.وتی دەمەویّ ئەوڕۆ لەگەڵما بیت، مامەڵەی پارەیشت لەگەڵ ناکەم، گەر ئەو کارانەی دەمەوێت بۆمی بکەیت، چەندت ویست دەیکەمە سەرسەرم، چونکە من نابینام و (زەردە)ش شارەزا نییە.

گوتی من ناوم(چالاك)ە، خەڵکی مهابادم، چییت دەویّ بە چاوان. بڵند وتی زۆر خۆشحاڵم، پەڕاوێکی دایە دەستی و وتی سەرەتا بمگەیەنە ناونیشانی نێو ئەم پەڕاوە، پەڕاوەکەی خوێندەوە و وتی ئەم ناونیشانە زۆرئاسانە، بەڵام زۆر سەیرە، ئەم پەڕاوە مێژووی حەڤدە ساڵ لەمەوبەری پێوەیە.

– حەڤدە ساڵە ئەو پارچە پەڕاوەم هەڵگرتووە و پاراستووە، ناونیشانی ئەو نەخۆشخانەیەی تێدا نووسراوە، حەڤدە ساڵ لەمەوبەر تووشبووانی کیمیابارانەکەی هەڵەبجەکەمی تێدا چارەسەردەکرا، ئەوەیش چارەسەرنەکرایە بۆ وڵاتان دەیانناردن، من یەکیّ بووم لەو کەسانەی بۆ ئەورووپا ناردیانم بۆ چارەسەری چاوەکانم، بەڵام ئەوانیش نەیانتوانی چاوەکانم چارەسەربکەن، لەو ساڵەوە ئێستە وا دەگەڕێمەوە، جا دەمەویّ بمگەیەنیتە ئەو بیمارستانە تا لە دایکم و ڕاز دڵنیا بم پاش من چییان بەسەر هاتووە و بۆ کویّ ناردویانن.

چالاك به پەرۆشەوە وبە پەلە دەرگای ئۆتۆمبیلەکەی بۆ کردەوە و لە پێشەوە سواری کرد و زەردەش لە دواوە.
بڵند وتی پاش دڵنیابوون لە کەسەکانم، دەمەوێ بمگەیەنیتەوە سنوور، ئەوکات چەندی کرێت ویست بەوپەڕی سوپاسەوە دەتدەمێ.چالاك وتی هیچ خەمت نەبێ، هەمووی جێبەجێ دەکەم. زۆر ڕۆیشتن، تا لەشوێنێکدا وەستا و وتی ئێرە شوێنی ئەو بیمارستانەیە کە لەو پەڕاوەدا ناونیشانەکەیت پاراستووە.بڵند وتی دەکەواتە با دابەزین و پرسیار بکەین، هەواڵی دایکم و ڕاز بپرسین.هەر بە پەلە دەرگای بۆ کردەوەو گوتی پێویست ناکات سەگەکەت دابگرین، چونکە خۆم دێم. وتم سوپاس، چونکە منیش فارسی نازانم.چوونە پرسگەی خەستەخانەکە، بەڕێزەوە فەرموویان لێکردن.فەرمانبەری تایبەت، (دۆسیەکانی ساڵی (١٩٨٨) ی دەرهێنا، ناوی (بڵند خۆی و دایکی و ڕاز)ی بۆ دۆزینەوە، بڵند بۆ"چارەسەری چاوەکانی بۆ ئەوروپا نێردراوە.دایکی و ڕاز چارەسەرکراون، بۆ شارەکەیان چوونەتەوە).
چالاك گوتی ئەوا دڵنیا بووی، چیی دیکەت لێرە دەوێت.بڵند گوتی لە خوا بەزیادبێت ماون ودڵشکست نەبووم، زۆر سوپاسی فەرمانبەرەکەیان کرد، پاشان وتی چالاك ئێستا تا سنور مەوەستە.
تارانیان جێهێشت، پاش دوو کاتژمێرێ لە ڕۆیشتن، شەویان بەسەرهات، لە چێشتخانەیەکی سەر ڕێ وەستان، پاش نانخواردن

وپشوودان، کەوتنەوە بڕینی ڕێ، زەردە هەر تەماشای چواردەوری خۆی دەکرد، نامۆیی و ناشارەزایی پێوە دیاربوو.
زۆر لە بارەی خۆی وشارەکەی، ژیانی تاراوگەیی بۆ چالاك باسکرد تا دڵی داکەوت کە جگە لە نیان و ئالان، بۆ کەسی تر لە بارەی خۆیەوە بۆ هاوزمانی خۆی باسینەکردبوو، وایدەزانی دونیایەکی دیکەیە، یا خەونێکە لە خەونەکانی شەوانەی.چالاك بە گێڕانەوەی ژیاننامەی بڵند وکارەساتە دڵتەزێنەکەی شارەکەی بۆ ئێستێك چووە نێو خەیاڵەوە، ئەو ئازارانەی بڵندی خستە پاڵ چەندین ئازاری هاوشێوەی گەلەکەی، ئاهی لە ناخەوە پێهەڵکێشا وپاشان گوتی هیچ نەتەوەیێ نییە هێندەی ئێمە کارەساتی دڵتەزێنی بەسەر هاتبێ، ( هیچ نەتەوەیەکی چل ملیۆنی نییە لەسەر ڕووی ئەم زەمینە دەوڵەتیی نەبێ وخۆی حوکمی خۆی نەکات!!).
ڕێ چراخان بوو، مانگی ڕێبەندان بوو، نم نم باران دەباری، بڵند دەترسا لەوەی باران وبەفر ڕێنەدات بە ئاسانی بگاتەوە شارەکەی، ببووە پرسیارێك وتی دەبێت ڕێگە هەبێت لە سنوور بپەڕمەوە؟ گوتی بارانەکەی وا نییە وبەفریش نەکەوتووە، گەر بشکەوێ ڕێگەکان پاکدەکەنەوە، گەر هەر ڕێگەش نەبوو، دەچینە مهاباد بۆ ماڵی ئێمە.
= زۆر پەلەمە بگەمەوە، نازانم خۆمیش نازانم حەڤدە ساڵ لە تاراوگە بووم هیچ کات ئەوەندەی ئێستە پەلەی گەیشتنەوەم نەبووە، هەر لە چاوەڕوانی چاکبوونی چاوەکانمدا بووم و

چاکنەبوون، ناچار بگەڕێمەوە بە نابینایی، بەڵام نازانم زۆر هیوام هەیە بە چاکبوونی چاوەکانم، لەوێ دەیانوت ئێستە لە تاران باشترین دکتۆری چاو هەیە.چالاك وتی ئێران چەندین چاوی چاکردووە، گەر ویستت و پارەت هەیە، دکتۆری هاوڕێی تایبەت بە چاوم هەیە.گەر پەلەت نەبوایە دەچووینە لای، بەڵام پاشئەوەی لەگەڵ کەسوکار شادبوونەوە، دەمەوێ پێوەندییم پێوەبکەی، چونکە باشترین پزیشکی چاو لە تاران هەیە.کارتێکی تایبەت بە خۆی دەرهێنا کە ئەدرێس وژمارەی تەلەفۆنی تێدا تۆمارکرابوو، دایە دەستی بڵند ووتی، بەو نمرەیە پێوەندییم پێوەبکە، ئیدی هەموو شت لەسەر من.بڵند سوپاسیکرد.تا زیاتر هیوا ببەخشێتە بڵند وتی کەی پاش نەشتەرگەریت لای باشترین پزیشکی تاران، بە چاوانت منت بینی، ئەوسا سوپاسم بکە.

– (ئێستە پەشیمانم چەندین ساڵ لە پێناو چاوێکی ساغ لەو وڵاتە خۆم بەندکردبوو، زەردەم بە خۆمەوە ماندوو کردبوو( گوێی لە ناوی خۆی بوو، نوورزەیەکی لێوە هات). هەردووکیان پێکەنین، ئەویش حەپەیەکی کرد.

چالاك : بە ڕاستی سەگێکی تایبەتە.

بڵند : باشترین و بەوەفاترین هاوڕێمە.

کە شنە بایەکی خۆش لەگەڵ کردنەوەی جامەکە بە ڕوویدا هات، بێئەوەی پرسیار بکات وتی زۆر نزیکبووینەتەوە، گەر هەڵە نەبم ئەم شنەبایە بە شنەی چیاکانی دەوروبەری شارەکەمان

دەچێت.هەڵمژینی ئەو هەوا سووکە هەرچی کۆتوبەندی نامۆیی ودڵتەنگی هەبوو بچڕانی، تەنانەت هەستیدەکرد چاوەکانی دەبینن، دیمەن بە دیمەنی ئەو دەڤەرە ببوونە چەند تابلۆیەك وخۆیان پێشاندەدا، هەر تابلۆیەك بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕایەوە، (دیمەنێکیان شوانیێ بوو لە قەت پاڵی شاخیێ شمشاڵی خۆی دەژەن و بزن و مەڕ ومالاّتەکەی بە دەنگی ئاوازی ئەو شمشاڵە کپ وبێدەنگ دەلەوەڕان، هێند چووبووە نێو دەریای قوڵی خەیاڵەوە، ئاوازی شمشاڵەکە گوێی دەزرینگاندەوە، ئەشکی لە چاوان قەتیس کردبوو.

(دیمەنی دووەم گەلەگورگی برسی بوون، هەستونەستی شوان و ڕانەکەی شێواندبوو، یەکیان پاشئەوەی دەمی سوورببوو لە خواردنی مەڕیێ، بەوەشەوە نەوەستا چەندین مەڕ وبزنی دیکەی خنکاند، پاشان شمشاڵی شوانی بە دەمی گرتبوو و ڕفاندی، ئەوانی دیکە هەر یەکەیان دەمی لە نێو لاشەی مەڕ و بزندا بوو، خوێنی گەشیان تێکەڵ بە لەوەڕگە سەوزە کەیانی کردبوو).

لە پڕ چالاك وتی زۆر نەماوە بگەینە بازگەی سنوور، دووبارەی کردەوە، ئەوسا وەلاّمێك، پڕ خەم، تێکەڵ بە خەیاڵێکی دڕندە ئامێزی دایەوە.چالاك وتی هیچ خەمت نەبیێ، ڕۆژێك دێت بە چاوانت دیمەنی ئەم دەڤەرە دەبینییەوە، ئێستە وا لە مەرز نزیك بووینەوە، کە گەیشتین، (یا ماشێنم لە سنوور ڕادەگرم و دێم بۆ

دۆزینەوەیماڵتان، یا شوفێرێکی شارەزات بۆ بە کرێ دەگرم تا ماڵتان بە ئاسانی بدۆزێتەوە).

– ماڵت هەر ئاوەدان بێت و لە وێنەت زۆربێت، بەڵام پێت نەگوتم کرێکەت چەندە؟

– کرێم ناوێ، من بە ئەرکێکی پیرۆزی سەر شانی خۆمی دەزانم.

– ناکرێ وڕازی نابم، پارەی باشم پێیە وهەژارێك نیم تا هاوکاریم بکەیت، جگە لەوەش تۆ لە ئەرکی خۆت زیاترت بۆ کردوم، جا دەمەوێ چەندێ دەڵێی پێتی بدەم.هەر ڕازی نەدەبوو کرێی لێوەرگرێ.دەستی خستە گیرفان و ڕێزمەیەك دۆلاری دەرهێنا وگوتی گەر ئەمەش بە کەم دەزانی با پارەی دیکەت بۆ دەربێنم. پێکەنی وگوتی ئەمە کرێی بیست جاری هاتووچۆی تارانە، یەك سەد دۆلاری لێدەرهێنا و گوتی،ئەم سەد دۆلارە لەبەر دڵی تۆ وەردەگرم.زۆر هەوڵیدا سەد دۆلارێ پتر وەرگرێ بێسوود بوو.

پاش حەقدە ساڵ وبۆ یەکەمینجار بە هەراوهۆریا و چەندین جۆر لە دەنگی منداڵ و لاو و ژن و بە ساڵاچوو، گوێی زرینگایەوە.

وەستان ودابەزین، توند پەتی سەگەکەی لە دەست گرتبوو، عودەکەی بە شانییەوە، گۆچانە زەنگوڵدارەکەی بە دەستەوە و چالاك لە تەنیشتیەوە دەڕۆیشت، پەڕینەوە، دەنگی بانگکردنی شوفێران بۆ پەیداکردنی سەرنشین، بەرزی ونزمی دەنگەکان وتێکەڵبوونیان، فەرموو فەرموویان لە سەرنشینان، کێبڕکێیان، نیشانەیەکی تەواوی شەڕی بە دەستهێنانی پاروە نان بوو،

هەژاری بوو.چالاك بە شوفێرێكی گوت دەمەوێ ئەم هاورێیەم بگەیەننە ماڵی خۆی.وتی بەچاوان، ماڵی لە كوێیە؟بڵند وتی گەڕەكی (ش). گوتی زۆر باشە، منیش لە گەڕەكی(ن) دادەنیشم، بەڵام پێم سەیرە، كەم كەس هەیە نەیناسم، نازانم تۆ بۆ ناناسم؟

– حەڤدە ساڵە ئێرەم جێهێشتووە، ئێستە وا دەگەڕێمەوە.

چالاك وتی برای بەڕێز نەمانزانی ناوت چییە؟..

– كاوە.

– من ناوم چالاكە و ئەم بەڕێزە ناوی بڵند، درێژەی بە قسەكەیدا و وتی، گەر بە دڵنیاییەوە دەیگەیەنی، ئەوە زۆر سوپاستدەكەم، گەرنا، خۆم دێم تا ماڵەكەیان نەدۆزمەوە ناگەڕێمەوە.

كاوە: خەمت نەبێت، هەرچیی بە من بكرێ و ئەو بیڵێ دەیخەمە سەرچاوانم.

بڵند:زۆر سوپاس، بە ڕاستی بەختم هەیە، توشی پیاوی وەك جەنابت و كاكە چالاك بوومە، بە ڕاستی ئێوە كەسی منن.

پاش دڵنیابوونی لە گەیشتنەوەی بڵند، ماڵاوایی لێكردن وگوتی پێوەندییم پێوەبكە، هەوڵدەدەم لای باشترین پزیشكی چاو لە تاران چارەسەریت بۆ بكەین.ئەمەش بووە هیوایەكی بڵند......

ئۆتۆمبیلەكەی بەرزبوو، لە جۆری لاندكرۆزەر، لەپێشەوە دانیشتبوو و زەردە لە دواوە، بەڕێكەوتن.

كاوە: لە كوێی گەڕەكی(ش)نن؟

– ئەو ڕیزە ماڵەی ڕووی لە باخەكانە.

- ماڵی کێی پێدەگوتریْ؟
- باوکم ناوی (محەمەد)ە، بەلاّم پێش کارەساتی کیمیاباران بە چەندین ساڵێ کۆچی دوایی کردبوو، دایکم، ناوی (پیرۆز)ە، لە کارەساتەکە(من وشەونمی خوشکم و دایکم)لە نێو ڕەز وباخ بووین، بەلاّم ئەوانی دیکەمان چونکە لە ماڵ بوون، دڵنیام تیاچوون، لە ڕێگە بە هۆی کاریگەری کیمیاکە شەونمی خوشکم گیانی لە دەستدا، منیش بە نابینایی ماومەتەوە، بە هۆی کیمیاکە چاوەکانم لە دەستچوون.
کاوە : کیمیابارانەکە جگە لەوەی پێنج هەزاری لێفەوتاندین، دە هەزاری لێبریندار و نەخۆش کردین، تا ئەوڕۆش بە دەستییەوە دەناڵێنن.
بڵند : ئەی ئێوە چۆن ڕزگاربوون؟
- گەر من و دوو خوشکم بە سەردانی نە چووینایە بۆماڵی باپیرم لە خورماڵ، ئێستە وەك دایك وباوك و دووبرا وخوشکێکم تیاچوو بووین.
بڵند : بڕواناکەم خێزانێکی شارەکەمان بە ساغی لەو کارەساتە شووم و دڵتەزێنە ڕزگاربووبیْ؟
کاوە : نەخێر نییە، مەگەر یەکێ لەو کاتە لە دەرەوەی شار بووبێ.
زۆر حەزیدەکرد پرسیاری ڕاز بکات، هەر بۆیە کەوتە پرسیارکردن لە گەڕەکی (ن) جێدڵخوازەکەی، گوتی چەند خێزان لە گەڕەکتان ڕزگاربووە؟

- زۆربە تیاچوون، مەگەر هەر وەکو گوتم ئەوانە نەبێت کە لەو کاتەدا لە دەرەوەی شار بوون.

بڵند : هەبوو لە تاران چارەسەرکرابێت وپاشان گەڕابنەوە؟

- بەڵێ هەبوو

= دایکی من لە گەڕاوەکانە.کچێکی لەگەڵدابوو بە ناوی ڕاز، کە لە گەڕەکتانە.

کاوە : زۆر ڕاستە، وابێت ئێستە دایکتم باشتر ناسی، چونکە من بە ئۆتۆمبیلەکەم لە سەر مەرزەوە ئەو و ڕاز ی مام مەحمود لە گەڕەکی(ن) بوون هێنامنەوە.لەو خێزانەش تەنیا ڕاز وباوکی دەرچوون، ئێستە پێکەوە دەژین، ئەویش بە هۆی ئەوەی باوکی لە شارێکی دی بوو.(تەوژمی تەزوو جەستەی تەزاندبوو، هێندە نەبوو چاوەکانی بکرێنەوە)نەیدەزانی چ پرسیارێ دیکە بکات، جوڵەکانی وپرسیارەکانی ئاسایی نەبوون، ڕەنگی گەشبووەوە، دڵی کرابووەوە وەك کەسێ چاوی کرابێتەوە، ڕووی لە کاوە کرد وپرسی تۆ دڵنیای ڕاز و باوکی پێکەوە دەژین؟

- چۆن دڵنیانییم، ئەوان لە گەڕەکمانن، بەڵام باوکی کە لەو شارە گەڕابۆوە و چووەوە و ماڵ و کچ و کوڕەکانی بینی بە کیمیایەکە گیانیان لە دەستدابوو، زۆر تێکدەچێ و تا ئەوڕۆش باری دەروونی باش نییە.

دڵخۆشبوو (ڕاز) شووی نەکردووە، دڵخۆشییەکە وای لێکرد، بیری نەبوو چاوەکانی نابینن، لە پڕ چاوەکان هاتەوە یادی، لە دڵی

خۆی وتی(بە من چیی، بۆچی شوو بە من دەكات، تا مردن ژیانی لەگەڵ كوێریێ وەكو من بەسەربەرێت، هەر خۆی دڵی خۆیدایەوە وگوتی بەلاّم ئەو بەڵێنی پێداوم( یا بۆ یەكدیبین یا بۆگڵ).لە پڕ كاوەی شوفێر گوتی:

بۆوا بێدەنگبووی، دڵنیابە هەموو شت بە ویستی تۆ دەبێت. خۆشەویستیی بۆ ڕاز داگیری كردەوە و هەموو یادەوەرییەكانی ژوانی نێو باخ، ڕاكردن لە دەست كیمیاباران، ڕاسپاردەی هەڵۆ، هەموو دیمەنێكی تابلۆییێ بوو وشارەكەی لا شیرینتر دەكرد.

كاوە وتی ئەوا گەیشتینە نێو شار.

– نیشتیمان زۆر خۆشەویستە، جا من ئەوڕۆ دیمەن بە دیمەن دەبینم نەك بە چاوە نابیناكەم، بەڵكو بە سەراپای جەستەم، هەر بۆیە دەڵێم سەیرت نەییێ وەك چاو ساغیێ شوێنەكانت پێدەڵێم.

– ئێستە پێم بڵێ گەیشتووین بە كوی؟

– نزیك نێو بازاڕ بووینەتەوە، پێش چوونت بۆ نێو بازاڕ، لە كۆڵانێكی تەسكوباریك لابدە، ڕوو لە گەڕەكی(ش) دەبیتەوە.لەو كاتە لە كۆسپێكیدا، یەكسەر گوتی، ئەم كۆسپە حەڤدەساڵ لەمەوبەر بە پیكابەكەم لێمداوە، بەمە دەزانم دەبێت لێرەوە لابدەیت، هەر بەمەش دەزانم (خزمەتگوزاریشی بۆ نەكراوە، وێڕای ئەوەی ئێستە حكومەتی خۆمان هەیە).

– ماڵتان دەزانم، كاتی خۆی دایكتم گەیاندووە.

**که چوونه نێو گەڕەکەکەوە، دوو کۆلانی دیکەی لێدەبووەوە، کاوە بە کۆلانی لای چەپدا بایدایەوە بلند گوتی دڵنیام هەڵەت کرد، دەبوایە کۆلانی دەستی ڕاستت بگرتایە تا ئەوسەری نەوەستیتایە، نەك کۆلانی لای چەپ.گەڕایەوەو پرسیاری لە یەکدوو منداڵکرد کە یارییان لە نێو کۆلانەکە دەکرد، ( ماڵی پوورە پیرۆز لە کوێوەیە)؟ منداڵێ وەڵامی دایەوە وگوتی، ئەوسەری ئەم کۆلانە خۆیەتی.**

**- بە ڕاستی زیرەکی، پاش حەڤدەساڵ توانیت ماڵی خۆتان بدۆزیتەوە، بەگاڵتەوە گوتی جا چوونە پزیشکت بۆچییە تا چاوانت چاکبێت، خۆ تۆ لە من شارەزاتری.**

**لە دڵیخۆیدا وتی تا چاوە جوانەکانی (ڕاز)ی پێببینم!!**

**دابەزین، دەرگای بۆ زەردە کردەوە، یەکسەر خۆی گەیاندێ و سەری پەتەکەی ملی پێدا، منداڵەکانی گەڕەك هەموو هاتبوونە سەیریان و دەیانگوت سەگێ چەند جوان و زیرەکە، کاوە لە دەرگایدا، بلند گوێی دابوویێ، دەیویست ئەو دەنگە بێت کە زۆر لە مێژە تامەزرۆی بووە، هەروابوو، بە دەنگە زولاڵەکەی گوتی کێیە وا هاتم، زۆر بە پەلە دەرگای کردەوە.**

**کاوە: پوورە پیرۆز چۆنی؟**

**سەریسوڕمابوو هیچی بۆ نەگوترا.**

**- ئەی بۆ فەرمووومان لێناکەیت؟**

**بلند لە شوێنی خۆی نەدەبزوا، بۆ ئێستێك سەرسامبوو، زمانی بووەوە وگوتی دایکە گیان، نامناسیتەوە؟!**

دایك: بڵند گیان، ڕۆڵەكەم، باوەشی پێداكرد، وتـی ئەمشـەو خـەونم پێوەبینیـت، تێـر یــەكتریان گوشــی، بەوپــەڕی تامەزرۆییــەوە سەرودەست وچاویی دایكی ماچدەكرد، دایك لـە كڵپـەی گریانیـدا، بۆی دەركەوت كوڕەكەی نابینایە، لـە پڕ پـووره پیرۆز كەوتـە سـەر زەوی، خەڵكی گەڕەك كۆبوونەوە، تا بە هۆشی خـۆی هاتـەوە.پـوره زەینەبی دراوسـێ هەر مابوو لە كارەساتەكە ڕزگـار ببـوو، هـەروەكو پووره پیرۆز باوەشی لە بڵند دا.وتی دایكت هەربەیانی بەو زوویيە پێیـوتم (زەینــەب خــەونم بـە بڵنــدەوه بینیــووە، دەبـێ ڕۆژێ بێـت ونەگەڕێتەوە؟!).بە پیرۆزی گوت دەهەستە ودڵـی بڵنـد تـەنگ مەكـە، نـەك هـەر تـۆ دراوسـێكانیش بـە هاتنـەوەی بڵنـد دڵخۆشـن و ئـەم خۆشییەمان لێ تێكمەدە.پووره پیرۆز وتـی قوربـانی هـەمووتان بم، كوڕ هەر كوڕی من نییە، باوەشی لێدایەوە گـوتی چەندین سـاڵە لـە كوێی وخۆت لێشاردوومەتەوە؟!

هـەموو ئەوانـەی لەوێـدا بـوون دەگریـان) كـاوە بـە پەڵمەگریانـەوە (پـووره پـیرۆز زۆر سـاردە با بچینە ژوورەوە وكـەمێ پشـوو بـدات، ئەوكات چ پرسیارت هەیە بیكە).كاوە گۆچانەكەی پێدا وزەردەش پەتەكـەی ملـی دووبـارە خسـتە نێودەسـتی، هـەموو دراوسـێكان گریانەكەیان بووە پێكەنین، هەر یەكە و لای خۆیـەوە بە سەگەكەیا هەڵیانئەدا، یەكێ دەیوت زۆر جوان ڕایانهێناوە، یـەكێ دیكـە، لـەو وڵاتانە ماف ئاژەڵ هەیە و هیچ كەس ناتوانێ مافیان پێشێل بكـات، یەكێ ئەیوت كاك بڵند چۆن ئەم سەگەت دەستكەوت؟

بڵنـد: ئـەم سـەگە تایبەتـە بـە نابینایـان وبڕوانامـەی ڕاهێنـانی شارەزایی لە چۆنیەتی کارئاسانی نابینایانی هەیە، جگە لـەوەش خواردن، نووستن ومووچەی تایبەتی خۆی هەیە.

کاوە : براینە فەرموون لەگەڵمان وەرنە ژوورەوە.

هـەموو چـوونە ژوورەوە، پـوورە پـیرۆز هـەر نـزای دەکـرد ولـە خـوا دەپاڕایـەوە، جاروبـار باوەشـێکی پیـادەکرد وبـۆنی پێـوەدەکرد، بڵندیش وەك ئەو تامـەزرۆ بـوو، بـۆنی دایکێتییەکـەی هەڵدەمـژی و بە تەواوی بە ناخی خۆیدا دەیبرد.زۆر پەشیمانبوو ئەو ماوە زۆرە لـەو وڵاتـە نەدەگەڕایـەوە، هەسـتیدەکرد چـاوەکانی یەکەبەیەکـەی دەبینی.

ماڵ بە تەواوی جەنجاڵ ببـوو، تـا ئێـواریٚ کـاوە جێینەهێشـت، وەك برایـەك میوانـەکانی بەڕێـدەکرد، جگـە لـە دراوسـێکان زۆری دیکـە دەهـاتن، بەڵام هەموو کاتێك و لـە هـاتنی هـەر میـوانیٚ هەسـتی لـە دەنگەکان ڕادەگرت تا بزانیٚ ئاخۆ دەنگی ڕاز نابیستیٚ، ئەو دەنگـە ناسـکەی هـەڵگری یادەکـانی هـەموو ژیـانی بـوو ...هـەموو ژیـانی.

جاروبـار دەیویسـت هـەواڵی ڕاز لـە دایکـی بپرسـیٚ، بـەڵام هـەموو جارەکان پەشیمان دەبووەوە، زیاتر لـەوە دەترسا کـاوە هەست بـە شتیٚ بکات.

شەو درەنگی کـرد ومیوانـان ڕۆیشـتن، ئـەوجا کـاوە گـوتی دەمـەویٚ بڕۆم، هەر کارێکت هەبوو دەیکەمە سەرچاوانم.

– نامەویٚ بڕۆی، ئەوڕۆ تۆم لە کارەکەتکرد وبە ڕاشکاوانە پێمبڵێ چەند کرێت بدەمیٚ؟

– دڵنیابە یەك دینار بە گیرفانم نایات، باسی بکەیتەوە زویر دەبم. زۆر وتی پیاوی چاکبە شتێکم لێوەربگرە، بەلاّم بێسوودبوو و دەیوت ئەوڕۆ خۆشترین ڕۆژم بوو، وا دەزانم یەکێکم لە مەزاری شەهیدەکانەوە زیندوو بووەتەوە.

بڵند : منیش کەستم.

– دەکەواتە چۆن دەبیٚ باسی پارە بکەیت؟.

سوپاسیکرد وئەویش مالاّوایی لێکردن ، خۆی و پیرە دایك مانەوە.

دایك :کوڕەکەم، دەمزانی ڕۆژێك دێت و دەتبینمەوە، بەلاّم خۆزگە چاوە جوانەکانت لە دەست نەچووایە، دای لە کوڵپەی گریان.

بڵند کەوتە دڵدانەوەی و گوتی دایکە گیان دڵی خۆت تەنگ مەکە، گەر منیش شەهید بوومایە ولە مەزاری شەهیدان بوومایە هەر وەکو ئێستە بوو، بەلاّم خوا لە چارەی نە نووسیبووین، ئەو ڕۆژە من وتۆ و شەونم لە نێو ڕەز وباخەکەمان بووین، خۆزگە ئەویش شەهید نەدەبوو، پێکەوە ئەو ژیانەی ماومانە بەسەرمان دەبرد.

دایکی ئێجگاری ئاگری تێبەرببوو زۆر بە کوڵ گریا، چووە لایەوە ودەستی لە ملی کرد وتی دایکە گیان پێویست ناکات هێند بگری، هەر خێزانی ئێمە نییە لەم شارە بەو کارەساتە شوومە لەناوبراین، پێنج هەزار لە ژن ومنداڵ وپیرو گەنجانمان بوونەتە قوربانی، جگە

له ده هەزار بریندار، نەخۆش، کەمئەندامی وەکو من، جا نامەویٚ دلٚتەنگ بی، ئیٚستە پیٚمبلٚیٚ مالٚ ڕاز چییان بەسەرهات؟
کاوە لەبارەیانەوە هەندیٚ شتی بۆ باسکردم، دلٚی بەو گریانە هیٚور بووەوە وگوتی کاوە چیی گوتبیٚ ڕاستە، چونکە خەلٚکی گەڕەکیانە و جگە لەوەش ئەو لە سنوورەوە من و (ڕاز)ی گەیاندەوە.
– دایکە گیان، کە گەیشتمە تاران کوڕیٚکی شوفیٚری کوردی مهابادی ناوی(چالاك)بوو، زۆر کارئاسانی بۆ کردم، لەو خەستەخانەیەی حەڤدە سالٚ لەمەوبەر تیٚیدا چارەسەردەکراین پرسیاری تۆ و ڕازم کرد، ناوەکانی دۆزییەوە وتی چارەسەرکراون وگەڕاونەتەوە، زۆر دلٚیان خۆشکردم جاریٚکی دی بە ئامیٚزی گەرمی دایك شادەبمەوە.
– قوربانت بم کوڕە جوانەکەم، کۆرپە شیرینەکەم، (بلٚند وایدەزانی مندالٚە، یا تەمەنی هەرزەکارییە کە دایکی وا ی پیٚدەگوت، (بە ڕاستی مندالٚ لە چاوی دایکوباوك هەر چەند گەورەبن ئەوان هەر وەك مندالٚییان لە پیٚشچاویانە).بەردەوامبوو گوتی کە گەڕامەوە، لەم مالٚە ساردوسڕە ژیانم بەسەردەبرد و بۆنی ئیٚوەم پیٚوەدەکرد، مندالٚەکانی دیکەیان ناشتبوو، ڕۆژانە دەچوومە سەر گۆڕەکانیان و لە فرمیٚسك ڕشتن بەولاوە هیچ دەستەلاٚتی دیکەم نەبوو، جگە لەوان چاوەڕوانی تۆش چاوەکانی کزکردم، بەلاٚم شەویٚ خەونم بینی، بۆ زەینەبم باسکرد، هەرلە دەرگا درا دلٚم خورپەیەکی کرد، زانیم خەونەکەمەو شوکور بۆ خوا هاتە دی، لەو ڕۆژەوە ڕاز و

باوکی زوو زوو دێن بۆ لام، جاروبار ماڵم بۆ پاکدەکاتەوە وهەموو کات دەڵێ من کچی تۆم، وەك شەهید شەونم دەبێ تەماشام بکەیت ، لە من زیاتر لە چاوەڕوانیتدایە وهەمیشە باست دەکات، دەڵێت هیچ کات ڕاسپاردەی براکەم لە یاد ناچێ منی بە بڵند سپارد، گەر لێرە بوونایە یەکەمین کەس دەبوون بۆ لات بهاتنایە، بۆیە دیارنین چوونەتە سلێمانی بۆ لای پزیشك، چەند مانگ جارێ دەبێت باوکی بەرێت، لەبەرئەوەی باری دەروونی باوکی باش نییە، چونکە کاتی کیمیابارانەکە باوکی لە سلێمانی دەبێت، هاتەوە وخێزانەکەی و خەڵکی شاری بینی لە ماڵ و لە کوچەو کۆڵان وسەرچەم و نێو ڕەز وباخەکان گیانیان سپاردووە، ئەو دیمەنانە زۆر تێکیدەدا و وەك شێتی لێدەکات، هەرلەو ڕۆژەوە هاتووچۆی پزیشك دەکات تا باری دەروونی ئاسایی بێتەوە.
دڵخۆشبوو، وێڕای ئەوەی چاوە جوانەکان و بەژن و باڵای بێوێنەی نابینێ، بەلأم خۆ گوێی لە دەنگی ناسکی دەبێ کە زۆر لە ناخۆشییەکانی ژیانی لە بیر دەباتەوە، ئاخۆ دەبێ بە هاوسەریم ڕازی بێ یا نا؟! ئەمە لە دڵی خۆیدا وایلێکدەدایەوە. وتی دایکە گیان ڕەز وباخەکانمان لە ناونەچوونە؟
- کوڕەکەم زۆری لە ناوچوون، بەلأم ئەوەی ئێمەو ماڵی ڕاز وچەند ماڵێکی دیکە بووژاونەتەوە.چەند ساڵێکە کرێکاری بۆ دەگرین تا کاری تیا بکەن.

- مەڵێ نابینایە، هەموو شتێ ڕوون وئاشکرایە لە پێشچاوانم.
دایکە گیان تەماشایەکی سەگەکە بکە بزانە چیی دەکات..
- لەوکاتەوەی هاتوون، کونوکەلەبەری حەوشەومالٚ دەپشکنێ، زۆر سەگێکی وریایە.
- زۆر خزمەتی منی کردووە و زۆریش بەوەفایە، یەکسەر بانگی کرد، زەردە وەرە.هاتە ژێر دەستییەوە ، بڵند دەستی بە سەریدا هێنا.
- کوڕەکەم، گلاوە دەستی لێمەدە.
- دایکە گیان، لەو ولاتانە زۆر ڕێز لە ئاژەڵ دەگرن، زۆربەی ماڵەکان ڕاياندەگرن، گەر یەکێ زوڵمیان لێبکات ومافیان پێشێل بکات سزا دەدرێ، هەندێ ولات گۆڕستانی تایبەتیان هەیە بۆ ناشتنی ئاژەڵەکان، خاوەنەکانیان سەردانیان دەکەن.( دەبوایە لێرەش شوێنێکی تایبەت لە شارەکەمان هەبووایە بۆ هەموو ئەو ئاژەڵ و پەلەوەرانەی بە کیمیابارانەکە لەناوچوون، چونکە ئەوانیش مافیان لە لایەن ڕژێمەوە پێشێلکراوە).
- شتێکی سەیرە، ئەو گاورانە هێند بە ویژدانن!!
- دایکە گیان ئەوان ماف هیچ بوونەوەرێك پێشێل ناکەن، جگە لە خانوو و مووچەی باش، ئەم سەگەیان پێداوم تا کارئاسانییم بۆ بکات، مانگانە پزیشکی تایبەت چاوەکانی پشکنیووم تا بزانن هیوای چاکبوونەوەی لێدەکرێ یا نا.
- ئەی کوڕەکەم، هیچ چاری نەبوو؟

– نەخێر دایکە گیان، بەڵام (چالاك) زۆر هیوای پێبەخشیووم لە تاران چاکبمەوە، وتی زۆر کەس چوونە بۆ تاران بۆ چارەسەری چاو، دەڵێن پزیشکی زۆر چاکی لێیە.

کەوتە پاڕانەوە لە خوا ودەیوت(خوایە گیان هەر ئەم کوڕەم ماوە، خۆت دەزانی چەندین ساڵە لە چاوەڕوانییم تا بیبینمەوە، خوا گیان چاوەکانی چاك بکەیتەوە).

– دایکە گیان هەر ئەو نزایەم بۆ بکە ، چونکە دەڵێن نزای دایك لای پەروەردگار گیرا دەبیٚ.

– ڕۆڵەکەم گەر بە نزای من بێت دەمەویٚ هەر ئێستە خوا کارێکی وا بکات چاوەکانی من بخاتە شوێنی چاوی تۆ.

– خوانەکا دایکە گیان.

– کوڕەکەم زۆر درەنگی کرد با بنووین، دڵنیام سبەینیٚ میوانمان زۆر دەبێت، ڕاز یش لێرە نییە تا فریام بکەوێت.

تەزووی بە لەشیدا هێنا ولە دڵی خۆیدا گوتی تۆ بڵێی ڕۆژێك بێت وبە ڕاستی ڕاز ببێت بە ئەندامێکی خێزانیمان؟! هەستایە سەر پیٚ وگوتی دایکە گیان، دەمەویٚ شوێنیٚ باش بۆ سەگەکەم دیاری بکەین. ڕێکەوتین ئەو ژوورە تایبەتەی نزیك دەرگای حەوشەی بۆ تەرخانبکەین، بەڵام زۆر بەزەیی بە زەردە دەهاتەوە، لەو شوێنە خۆش وتایبەتەی ئەوروپا، بە ناچاری دەبێت لێرە ژیان بەسەر بەرێت، پێیگوت زەردە لێرە بمێنەوە و نەکەی دەربچیت.

نوزەیەکی پڕ لە سکاڵا ونامۆیی بۆ کرد.سۆز و بەزەیی خستە نێو

دڵی و دڵی دەگریان.

چووه سەر جێیەکەی تا بنوێ، چەندین ساڵ بوو، تامەزرۆی ئەم شوێنە بوو، لەو شوێن نوستنە خۆشەی ژوورەکەی ئەوروپای، هەمیشە ماندوو شەکەتی پێوە دیاربوو، بەڵام لەسەر دۆشەکەڵەیەك لە سەر زەویەکە لێڕاکشاو بۆ یەکەمجار ئارامییەکی دەروونی بە خۆیەوە بینی، هەستی بەوەکرد، ئێستە پشووی تەواویدا، ئەو خەیاڵانەی حەڤدەساڵ لەمەوبەر لەم شوێنە یەخەیان دەگرت، هەرجاری ڕاز بە شێوەیەك خۆی پێشانیدەدا، ئێستە دیسانەوە هەمان خەیاڵ بەرۆکی گرتەوە.

نەیدەتوانی بنوێ، تا شەوێ درەنگ چاوی نەدەچووە خەو، لە پڕ گوێی لە دەنگی مەلای مزگەوت بوو، بانگی بەیانی دەفەرموو، دەنگێکی زۆر کاری بوو، ماوەیەکی دووروودرێژ بوو گوێی لەو دەنگە نەببوو، پووره پیرۆز بە پەلە هەستا وتی کوڕەکەم بڕۆ دەسنوێژ هەڵگره بانگی بەیانییە.

– دایکە زۆر لە مێژە نوێژم نەکردووە، تۆ بفەرموو، سبەینێ خۆم دەشۆم ولەبەر دڵی تۆ دەست بە نوێژ دەکەم.

ئەو بە سەلاوات لێدانەوە چوو بەرەو دەسنوێژ هەڵگرتن.ئەمیش دەیویست گەر بۆ ساتێکیش بێت بنوێ.

( ٣ )

## چاوەڕوانی

دووەم ڕۆژ بوو، میوانیٚ زۆریان بەڕێکرد، کاوە وازی لە کارەکەی هێنا بوو و زۆر دڵسۆزانە و وەك برایەك میوانەکانی بەڕێدەکرد، هەموو جارێك دەیگوت کاوە گیان بڕۆ بۆ کارکردنت، ئەو دەیگوت ئێمە براین و بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم.

(ئەو ڕۆژە پاش نیوەڕۆ کەناڵێکی تێلێڤیزیۆنی هات بۆ چاوپێکەوتنی، زیاتر خەڵکی هەموو کوردستان بە بەسەرهاتی بڵند یان زانی)، پاش ئەو چاوپێکەوتنە (لەبەرخۆیەوە دەیگوت دەبێت ڕاز لە سلێمانی تەماشا نەکات و زووتر نەگەڕێتەوە!!).

هەموو لێدانی دەرگا، دڵی دائەخورپا وهەر لە چاوەڕوانی ڕاز بوو، هەستی تەواوی بۆ دەنگەکان ڕائەدێرا، بەڵام دەنگی ڕاز نەدەهات. زۆرجار حەزی دەکرد کاتێك بێت میوانیان نەبێت، نەوەك شپرزەیی وشەرم بە ڕوویەوە دەرکەوێت و پێیبزانریٚ.

هەر ئەو ڕۆژە نزیك خۆراوا بوون، تەنیا خۆی ودایکی مانەوە وکاوە یارمەتی لێوەرگرتن وچووەوە، لە دەرگا درا، پوورە پیرۆز چوو دەرگا بکاتەوە، هەستایە سەر پیٚ، هەستی تەواوی لای دەرگاکە بوو، دڵ وچۆکی دەلەرزین، وەك ئەوەی پێیبڵێن ڕاز هات.

دەرگا کرایەوە، دەنگێکی ناسک وپڕ سۆز، دەنگیٚ سەراپای وروژان، ژیانیٚ تازەی پێبەخشی، ئەو دەنگەی خوێنی دەمارەکانی جەستەی گەشکردەوەوهێنایەوە جۆشوخرۆش ، لە مێژ بوو ئالۆدەی ببوو، لە مێژبوو بە عودەکەی بە نێو ئاوازەکاندا دەگەڕا تا بتوانیٚ هاوشێوەی ئەو دەنگە ناسك وپڕسۆزە بدۆزێتەوە، دەستی نەدەکەوت، بەلاّم وا ئێستە وپاش ئەو هەموو ساڵە، بە پەرۆشەوە دەلێت(پێشئەوەی بگەینەوە گەڕەك کاك کاوە بەرەو مالٚ دەچووەوە، بۆی ڕاگرتین تا بمانگەیەنێتەوە، باسی هاتنەوەی (بلّند) ی کرد، منیش زۆر بە پەرۆشەوە گوتم دەمەویٚ نەچینەوە بۆ مالٚ و بمانگەیەنیتە مالّیان، ئەویش یەکسەر ئۆتۆمبیلەکەی سوڕاندەوە وگوتی بە چاوان ئێمەی گەیاند و خۆی گەڕایەوە).
پورە پیرۆز هەر فەرموو فەرمووی بوو، دەیگوت بیٚ ئێوەییمان پێوە دیاربوو.مام مەحمود وتی بە (ڕاز)م گوت ئێستە کاتی نییە، شەویٚ دەچین، بەلاّم بێسوود بوو، گوتی دەچین چاوڕوونی لە پورە پیرۆز دەکەین.
چوونە ژوورەوە، باوکی ڕاز زۆر بە گەرمی خێرهاتنی لێکرد ودەستی خستە نێو دەستی، ئەویش دەستی ماچکرد، پاشان باوەشی پێداکرد، دەستیٚ دیکە خۆی خزاندە نێو دەستییەوە، ژوانی چەندین ساڵەی هێنایەوە یاد، ناسکی دەست وپەنجەکانی هەروەك خۆیبوون، هەمان جۆش وخرۆش و ئیشقی جارانی پێبەخشییەوە، بە دەنگە ناسکەکەی خۆشحالّی خۆی دەربڕی، لە

ئاستی ئەو دەنگە بە سۆزە، هێمن و لەسەرخۆ وەلامیدەدایەوە.
لەوکاتە بانگی ئێواریی فەرموو، مام مەحمود گوتی ڕاز
نەڕۆینەوە؟. دایکی سوێندی بە گۆڕی شەهیدان خوارد دەبێت
شەو بمێننەوە، بڵند تا ئەو کاتە هێمن ولەسەرخۆ و کەمێ
شپرزەیی پێوە دیار بوو، ڕەنگی سوورهەڵگەڕابوو، بەو کەشە
ساردە ئارەقی کردبوو، نێوچەوانی بریقەی دەهات، بە دەنگێ
تێکەڵ بە شەرمێکی زۆر(ئەو ساتە بە تەواوی هەستی بە نابینایی
خۆیکرد کە ناتوانێ چاوێ ببینێ بە درێژایی حەڤدەساڵە
تامەزرۆیەتی، ئەو ساتە زۆر پەشیمان بوو لە گەڕانەوەی، لە دڵی
خۆیدا دەیوت(چەندین ساڵە لەم ساتە دەترسام، ئەم ساتە
نەیدەهێشت بیر لە هاتنەوە بکەم!!)، کەوتە قسە وبێدەنگی پچڕان
وگوتی (زۆر خۆشحاڵدەبم نەڕۆنەوە» مامە گیان ئێوە بە نزیکترین
کەسی خۆمان دەزانین، هەرگیز ڕاسپاردەکەی شەهید هەڵۆ لە بیر
ناکەم کە (ڕاز)ی بە من سپارد. مام مەحمود هەناسەیەکی هەڵکێشا
وگوتی وا بێت با من فریای نوێژ بکەوم پاشان دێمەوە.ئەو ڕۆیشت
ودایکی گوتی منیش دەچم دەستنوێژ هەڵدەگرم.نێو باخی بیر
هاتەوە، چەندینجار پێکەوە بەو شێوەیە جێدەهێڵدران، بەلام
دڵتەنگی ونامۆیی ڕووی داپۆشیبوو، قسەی بۆ نەدەکرا ودڵ
ودەروونی کڵپەی گریانی بوو، چونکە لە بینینی چاوەکان و
بەژنوبالای ڕاز بێبەش بوو.ڕاز لێینزیك بووەوە وتی بڵند گیان بۆ
وا بێدەنگی؟بەدەنگێك پڕ لە نائومێدی، قوڕگێك پڕلە گریان،

شـپرزە وپەشـیمان، وتـی حەڤـدە سـاڵە چـاوەڕوانی چـاوێکی ساغبووم، دەمویست چاوەکانم چاکبنەوە تا بتوانم چاوەکانی تۆی پێببینم، بـەڵام بێهوودەبوو، نـەمتوانی ئـەو ئاواتـەم بێنمـە دی.ڕاز وتـی ئێمـە بەڵێنمانـداوە، یـا بـۆ یەکـدیبین یـا بـۆ گـڵ، هـەرگیز لـە بەڵێنی خۆم پاشگەزنابمەوە، چونکە خۆشەویستیمان پاکوبێگەرد بووە وهەردەبێت وا بمێنێتەوە. سوپاسـی بـەوەفایی کـرد و گـوتی، بـەڵام چـۆن یـەکێکی نابینـای وەك مـن دەکـەیت بـە هاوسـەرت، مـن پـارەم هەیـە، گـەر تـوانیم چـاوەکانم چـاکبکەمەوە ئەوسـا دەڵـێم بـا بەڵێنمان دوبارە بکەینەوە.

- بـەڵین یـەکجار دەدرێـت ونابێـت بـە دوو، دەمـەوێ پێشـئەوەی چاوەکانت چاکبنەوە بۆ یەکدیبین، دەبێت بەڵێنم ببەمە سەر، یا کـوڕی بـاش تـۆ پەشـیمانی ودەتـەوێ چـاوەکانت بکەیتـە بیـانوو؟! دەسـتی بـرد، دەسـتێکی لـەرزۆك، دەسـتێك بـاوەڕی نـەدەکرد، دەسـتێکی نـەرم وناسـك، هـەڵگری پێـنج پەنجـەی ڕێکوشمشـاڵی خزیـە نێـو دەسـتی، خـۆی بـۆ نـەگیرا دەسـتی ڕازی بـەرزکردەوە وماچیکرد وتی ڕازگیان چەندین ساڵی غوربەتیم چەشت، چەندین پزیشـکی پسـپۆڕ چـاوەکانیان پشـکنیم، بـەڵام نـەیانتوانی ئـەو هیوایـەم بێننـە دی تـا تـۆی پێببینـم.ئێستێك بێدەنگبوون، پاشـان دەنگی گریانی تێکەڵی هـەردووکیان ، ئـاوازێ بـوو، دڵـی شـەیدایی وچاوەڕوانی بە ئارامی دەشۆریەوە، لە ئامێزی یـەکترا توابوونـەوە، کەسیان باوەڕیان نەدەکرد، بێدەنگبوونەوە، بـەڵام تـەنیا دەنگ لـەو

چرکە ساتە، گریانی دڵەکان بوو.هەستیان نەدەکرد لەو ژوورەدان، وایانـدەزانی (دایکـی وشـەونم لـە کەپرەکـەی باخەکـەیان جێیـان هێشـتوون).پـڕ بـە دڵ گـوتی ڕازگیـان، بـە ئـارامی سـەری لەسـەر سـینەی بڵنـد نـابوو، بـە فرمێسـکە پاکوبێگەردەکـەی دڵـی دەشۆرییەوە، بە ئومێدێکی زۆرەوە، سەری هەڵبڕی و گوتی بڵند گیان نائومێد مەبە، کە بووینـە هاوسـەر، پێکـەوە دەچینە تـاران، چونکە باشترین پزیشکی چاو لەوێدا هەیـە وچاوێکی خۆمـت پێشـکەش دەکـەم.زۆر بـە شـپرزەییەوە گـوتی، نـا. . نـا. . نـا!! سوپاسـتدەکەم، چـۆن دڵـم دێـت چـاوی جـوانی تـۆ هـەڵکۆڵرێت، قسـەی وا مەکـە، هیـوای بینـینی چـاوە جوانـەکانتم لێمەکـە، مـن دەمـەوێ چاوە جوانـەکانت ببینمـەوە، پاشـان.... قسـەکەی تـەواو نەکرد وگوتی،گوێم لـە دەنگـی پێـی دایکمـە، بە ئاسپایی لـە یـەکتر دوور کەوتنـەوە، هاتـە ژوورەوە وتـی ڕاز گیـان تـۆ خـواردن ئامـادە دەکەیت یا خۆم بچم؟

- چۆن دێڵم تۆ بچی، هەر ئێستە ئامادەی دەکەم.

لـەو کاتـە لـە دەرگـادرا، دایکـی چـوو ولـە بـاوکی ڕازی کـردەوە. نەیـدەزانی چ خۆشـیێ بـوو ڕووی تێکردبـوو، تـەنیا ئەوەنـدە نـەبێ سـەراپای جەسـتە تـەزووی پێـدا دەهـات وکـوێرە کانیـاوێ بـوو، بارانی خۆشەویستی و ئیشق ڕوناکی کردبۆوە وهەڵیدەقوڵانەوە.

لەسەر خوانێك هەر چواریان دانیشتن ونانیـان دەخـوارد، یادەکـانی جارانیش ئابڵۆقەی خوانەکەیان دابوو.

ئەو شەوە تا درەنگ بە باسکردنی بەسەرهاتەکان بردیانە سەر، هەر ئەو شەوە بڕیاریاندا سبەینێ لەگەڵ کاوە بچن بۆ مەزاری شەهیدان وپاشان بۆ نێو ڕەز وباخەکانیان.

بەیانی بوو، لە خەو هەستا، سەمفۆنیای ئەو بەیانییەی ناسکی دەنگی ڕاز بوو، وشەکان جوانترین وشەی ئەو بەیانییە، کە زۆر لە مێژ بوو چاوەڕوانی ئەو وشەیەی دەکرد(بەیانیت باش)، چووە ژوورەکەی وواپێگوت، بڵند هەستایە سەرپێو وەڵامی دایەوە (ژیانت باش)، یەکسەر پرسیاری باوکی لێکرد، نەوەکو لێیانەوە نزیك بێت، گوتی بە هۆی کیمیابارانەکەوە کەمێ باری دەروونی ئاڵۆزە ودڵی تەنگە، هەر بۆیە بەیانیان زوو دەچێتە دەرەوە پاشان بۆ نانخواردن دەگەڕێتەوە.

بڵند :بە ڕاستی خەڵکی بە هۆی کیمیایەکەوە پەرێشانن وجۆرین نەخۆشی ڕووی لە شارەکەمان کردووە، زۆربە لەوانەیە حەزیان بکردبایە شەهیدبوونایە نەك ئەم ژیانە تاڵە ببەنە سەر.

– بەڵی ڕاستە من خۆم تەنگە نەفەسیم هەیە، بەڵام لەبەر تۆ کە دەمزانی ڕۆژێك هەر دەتبینمەوە، بۆیە هەرگیز حەزم بە مەرگی خۆم نەکردووە.

– ئاشق حەز بە مردن ناکات، تا ترووسکایێ لە هیوای بینینی ئیشقەکەی هەبێت.چەندین ساڵە لە پێناوی تۆدا حەز بە ژیان دەکەم، حەز بە چاکبوونی چاوەکانم دەکەم تا تۆی پێببینم، قوربانی چاوەکانت، قسە خۆشەکانت بم، ژیانت لەبەر چاوم

ڕووناك كردووەتەوە، گەر چاوم چاك نەبێتەوە تۆ دەبیتە دوو چاوی ساغم. – دەمەوێ زوو بنێری بۆ خوازبێنیم، نەوەكو مەرگ ڕێم پێنەدا. – قسەی وامەكە، خەمت نەبێ زوو دەنێرم.بە نازێكی كچانەوە وتی سوپاس ، پاشان وتی تا دایە بانگی نەكردووم خۆم با بچم خواردنی بەیانی ئامادەبكەم.لەوكاتە لە دەرگا درا، بڵند گوتی با بچم دەرگاكە بكەمەوە، ڕاز بە پەلە گۆچانەكەی بۆ هێنا ودایە دەستی، كەمێ ڕۆیشت، هەستی بە شەرم دەكرد، بە تایبەت لە پێشچاوی ڕاز، هیچ كات هێندە لە كەوتن نەدەترسا، زۆر بە وریاییەوە دەڕۆیشت، لە پڕێكدا دەستی گرت، بەهارێكی پڕ لە ئیشق وجوانی خۆی خزاندە نێو جەستەیەوە، هێندەی نەمابوو ڕووناكی بە چاوەكانی ببەخشێ.سوپاسیكرد، وتی فریام كەوتی. كە بووینە هاوسەر، نایەڵم گۆچان بە دەستەوە بگری، چاوەكانم لەبری چاوەكانی تۆ دەبێت، ئەمجارەیان قۆڵی خستە نێو قۆڵی و وتی هەمیشە دەبێت بەم شێوەیە بەڕێوە بڕۆین، تا خەڵكی فێربكەین وبزانن خۆشەویستی وئیشق مانای چییە!!

زۆر دڵخۆشبوو، وایدەزانی ئەوڕۆ ئاهەنگی گواستنەوەیانە و بەرەو مانگی هەنگوینی بەڕێدەكەون.گەیشتنە لای ژووری زەردە، وەڕی وپێدەچوو پێینا خۆش بووبێ ڕاز ڕێی پێشاندەدا.گوتی زەردە گیان، بێدەنگ بە، با دەرگا بكەمەوە هەر ئێستە دێم بۆ لات، تێیگەیشت هەر بۆیە بێدەنگبوو.

– زۆر سەیرە، زۆر باش تێتگەیشت.

– ئەی چۆن تێناگات، هەر بە زمانی کوردی لەگەڵیدا قسەم کردووە.لای دەرگای حەوشە وەستان، ڕاز قۆڵی لە نێو قۆڵی دەرهێناو گوتی من دەگەڕێمەوە. گوتی زۆر چاکە تۆ بڕۆ خواردن ئامادە بکە.دەرگای کردەوە.کاوە بوو و بەیانی باشی کرد وتی تەنیا ویستم بڵێم هیچ کارت پێم نییە؟

– ژیانت باش کاوە گیان، فەرموو وەرە ژوورەوە.گەر لە قسەم دەرنەچی ئەوڕۆ کاری زۆرم پێتە، بەڵام گەر دەربچی ئەوە کارم پێت نییە.

– تێناگەم مەبەستت چییە؟

– ئێمەو ماڵی مام مەحمود دەمانەوێ بچین بۆ مەزاری شەهیدان، پاشان بۆ نێو ڕەز وباخەکانمان، گەر کرێمان لێوەردەگری ئەوە باشە ونابێت بڕۆی، گەرنا، ئەوا بڕۆ و لەگەڵ یەکێکی دیکە دەڕۆین.

– بە چاوان، بەڵام کرێی بۆچییە؟

– تۆش کاسبکاری ، گەر ئێستە کارم پێت نەبێ دەڕۆیت بەرەو سنوور، جا دڵم مەشکێنە، پاشان من هەژارێ نیم تا هاوکارم بیت. پێکەنی وتی بە چاوان کرێت لێوەردەگرم.

– دەفەرموو وەرە ژوورێ دانیشە، تا خۆمان ئامادە دەکەین.

– تا ئێوە خۆتان ئامادە دەکەن، دەچم بەنزینی تێدەکەم.

ئەو ڕۆیشت ولەبەر مام مەحمود دەرگای دانەخست، چوو بۆ لای زەردە، دەستی بە سەریدا هێنا وئەویش زۆر لێستییەوە تا دڵی

دابکەویٚ.مام مەحمود هاتە ژوورەوە وتەماشای بڵند وزەردەی کرد وبزەییٚ گرتی وچوو بەرەو ژوورەوە، بڵند چووە گەرماوەکە پاشان ویستی بگەڕێتەوە، ڕاز خۆی گەیاندیٚ.

بڵند : کاوە بوو لە دەرگایدا، کەمێکی دیکە دێتەوە ودەمانگەیەنێتە مەزاری شەهیدان ونێو ڕەزەکانمان..هەر قۆڵی لە نێو قۆڵی نابوو تا نزیك دەرگای ژوورەوە لەویٚ دەریهێنا.

پاش نانخواردن، خۆیان ئامادەکرد، زۆری پێنەچوو کاوە بە خۆیو لاندکرۆزەرەکەیەوە گەیشت.ویستیان سەگەکە جێبێڵن ، بەلاٚم نەیتوانی وتی تا ئێستە بیٚ یەکتر دەرنەچووینە، دەرگای لێکرایەوە، یەکسەر پەتەکەی ملی خستە نێو دەستیەوە، کە ڕاز لە بڵند نزیك بووەوە، زەردە تەماشای ڕازی کردو مڕاندی، بە پێکەنین وچرپەیەکەوە وتی زەردە قینی لە منە وئیرەیی لە من دەکات، دەترسم ڕۆژێك پەلامارم بدات.

بڵند بە دەنگیٚ نەوی وتی باوەو دایە لێمانەوە دوورن؟

– بەڵیٚ دوورن.

– دڵنیابە، کە بووینە هاوسەر، ئەویش خۆشی دەویٚی و ئەوسا دەترسم ئیرەیی بە من بەرێت کە شۆخێکی وەکو تۆ هاوسەرمە.

سەرکەوتن وبەرەو مەزاری شەهیدان بە ڕێکەوتن.زۆر هەوڵیدا باوکی ڕاز لە پێشەوە دابنیشیٚ، بەلاٚم نەیهێشت، دایکی ومام مەحمود وڕاز لە دواوە دانیشتن، لە پشت ئەوانیشەوە، زەردە.

کارەساتی ڕۆژی کیمیابارانەکە وهاواری خەڵکی شارەکەی،

خستبوویه نێو خەیاڵێکی قوڵەوە، بێدەنگی کردبوو. لای مەزارەکە وەستا وتی ئێرە مەزارگەی شەهیدانە. بێوەڵامدانەوە، دەستی بۆ جێکردنەوەی دەرگاکە برد و کردیەوە، (ڕاز) بە پەلە دابەزی و گۆچانەکەی پێدا و بە دەنگێکی نەوی، گوتی لێرە شەرم دەکەم. داوای لێبووردن دەکەم.بڵند وتی من لە تۆ زیاتر.

زەردە مرەیەکی کرد تا دابەزێ وهاوکاری بێت، بەڵام کاوە وتی با نەیەتە ژوورەوە، خۆم هاوکاریت دەکەم.کاوە قۆڵی خستە نێو قۆڵی و چوونە نزیک مەزارگەکە و وەستان و مام مەحموود بە دەنگێکی بەرز گوتی: (الفاتحە).هەموو سورەتی فاتیحایان خوێند و پورە پیرۆز گوتی، زۆر ماوە بگەینە لای خوشکوبراکانت، کەوتینەوە ڕێگە، کاوە خێزان بە خێزانی ناسیاوەکان، یەکە بە یەکەی ناوی سەرکێلی بۆ دەخوێندەوە، دڕندێتی نامرۆڤانەی ڕژێم خەمباری کرد بوو، تەزوو لە نووکی پەنجەکانی پێیەوە تێپەڕ دەبوو، مووەکانی تەوقی سەری ڕەقدەکرد، قوڕگی پڕ لە گریان ببوو بۆخەڵکی شارەکەی، ڕقوکینەی بەرانبەر ئەو ڕژێمە، دڵودەروون وهەناسەی تەنگ کرد بوو.

لە شوێنێکی دیکە وەستان، باوکی ڕاز وتی (الفاتحە).دوای خوێندنەوەی سورەتەکە، پورە پیرۆز گوتی ئەمە خوشکوبراکانتە، ڕۆڵەکانم ئەوە کاکە بڵندە و بۆ لاتان هاتووە، کاوە کەمێ بردیە پێشەوە گوتی ئەمە کێڵەکەیانە.

دەستی دەلەرزی، گۆچانەکەی لە دەستکەوت، باوەشی لە کێلەکەیدا، کلپەی گریانێکی پەنگ خواردووی چەندین ساڵە و هەڵڕشت و ماچی کێلەکەیانی کرد و دەیگوت(شەونم گیان، بڕوا ناکەم تۆ لە ژێر ئەم خاکە بیت، تۆ گوڵێکی نەپشکوتوبووی، دەستێکی ڕەش هەڵیوەراندی، تۆ هەرخوشک نەبووی، خۆشەویسترین هاوڕێم بووی، خۆزگە ئێستە لە ژیان بوویتایە و بتبینیایە چۆن ئەو دەستە ڕەشە ڕووناکی لە برات زەوتکردووە.
برینی هەموانی کولانەوە، هەموو دەگریان، کاوە لە هەموویان زیاتر دەگریا، ڕاز نزیك کەوتبووەوە.گوتی کێلی هەلۆی برام ودایکم هەر لە تەنیشت شەونمە.هەستا، تەنیشتی لای ڕاستی هەڵۆ بوو، ئەمجارەیان ڕاز دەستی گرت، مەترێ نەڕۆیشت، دەستی خستە سەر کێلی شەهید هەڵۆ، یەکسەر ڕاسپاردەکەی هاتەوە یاد، لە کاتی سەرەمەرگدا، (ئاگاداری ڕازی خوشکم بە)ئەوان هێند هاتبوون ئاسایی ببوونەوە، بەلاّم بڵند لەگەڵ ناساندنی هەر کەسێکی، سۆز وبەزەیی و گریانی بە جۆشتر دەبوو.
کاوە زانی زۆر کاری تێکردووە، گوتی با بڕۆین، با سەرێك لە نێو ڕەزتان بدەین.بە دەنگی وەڕینی زەردە، زانی نزیك ئۆتۆمبیلەکە بوونەتەوە.لەبەر سەگەکەی حەزینەدەکرد خۆی دڵتەنگ و ماتەمین پێشانبدا، هەر لەبەر زەردە گوتی مامە تۆ بچۆرە پێشەوە، دەمەوێ لە زەردەوە نزیکبم.بڵند ودایکی وڕاز لەڕیز یەکدی دانیشتن، زەردەش لمۆزی گەیاندێ.

کەوتنە ڕێ لەگەڵ لێدانی هەر تاسەو کۆسپی ڕێگەیەك، شوێنەکەی دەگوت، (لە ناخەوە ئاهی بۆ بێخزمەتی شارەکەی هەڵدەکێشا)، هەموو سەریانسوڕمابوو، بەلاّم پێیگوتن، (بەئۆتۆمبیلەکەم چەندینجار ئەم کۆسپانەم بڕیووە، لەگەڵ شەهید هەڵۆ زۆرجار پێشبڕکێمان دەکرد، بە ڕازی گوت دێتەوە یادت؟

ڕاز : دەبێت هەبێت ئەو ڕۆژە خۆشانەی لە یاد بچێت.

کاوە: ئەو ڕۆژانە نابنەوە و ئەو خۆشیانە نابینینەوە.

مام مەحمود: شەهیدان شاریان لێچۆڵکردین، خۆشییەکانیان لەگەڵ خۆیاندا ڕاپێچکرد.

بڵند : ئەرێ کاوە گیان وا بزانم تەواو نزیکبووینەتەوە؟

ڕاز وەلاّمی دایەوە وگوتی زۆر ڕاستە، با هەر لەو پێشەوە بوەستێ، بە پێ دەچین بۆ نێو ڕەز وباخەکان.

بڵند :دەمەوێ ئەمجارە زەردە دابەزێ تا ئەم شوێنە خۆشە ببینێ.

بە پیاسەوە بەرەو نێو ڕەز وباخی هەنار وچەندین جۆرە میوەی دیکە هەنگاویان دەنا، پەتی زەردە لە نێو دەستیبوو، شنەبای نێو باخەکەیان بۆ جارێکی دیکە خوێنی لەشی بە جۆش هێنایەوە.

پورە پیرۆز : کوڕەکەم ئەمە ئەو کەپرەیە چەندینجار بە خێزانی دادەنیشتین ونانمان تێیدا دەخوارد وپشوومان لێیدەدا.

یادکردنەوەی خۆشی وناخۆشییەکانی ژیانی ئەوسا هێند کاری تێکرد، حەپەسابوو، پاش حەڤدە ساڵ، گەڕایەوە هەمان شوێن.

سەگەکەی لە پرێکدا پەتەکەی لە نێو دەستی ڕاپسکاند ودوور کەوتەوە، سەریسوڕما بۆ یەکەمجارە زەردە وا بکات.
بڵند :بۆ کویٚ چوو؟هیچ کات بێپرس لە دەستم نەڕۆیشتووە.
ڕاز : چووەتە ئەوبەر جۆگەکەوە، لە سێبەری ئەو دار هەنارە هەڵتووتاوە.
دایکی و ڕاز هەر شوێنێکیان پێدەگوت کۆمەڵیٚ یادگارییان بە بیر دەهێنایەوە.
بڵند : حەزدەکەم بە یادی جارانەوە لە ژێر کەپرەکە دابنیشین.
دانیشتن وبانگی زەردەی کرد تا ئەویش بێت، بەلاٚم دەستیکرد بە وەڕین، جاروبار وەك گورگ دەیلووراند.کاوە وتی لەوانەیە هەست بە تەنیایی وغوربەتی بکات.
ڕاز وتی بۆ ڕوو لە ئاسمان و وەك گورگ دەلوورێنیٚ؟
مام مەحمود: وەك بیستوومە، لوورەی سەگو ڕوو لە ئاسمان فریشتەو ڕوحەکان دەبینیٚ.
پورە پیرۆز : منیش هەر وامبیستووە.
بڵند : لەوانەیە ئێستە گیانی پاکی کەسەکانمان بەسەرمانەوەبن، ئەوانیش بە یادی جارانەوە، گەڕابنەوە، یا بە هاتنەوەم بزانن.
ڕاز : ئەمجارەیان وا بۆنی زەوییەکە دەکات.
بڵند : پێدەچێت ئێرەی زۆر پێخۆش بێت، یا هاوشێوەی شوێنێکە ڕۆژیٚ لە ڕۆژان تێیا ژیاوە.

مام مەحمود : وا نزیکی نوێژی نیوەڕۆ بووینەتەوە، با بڕۆین بەڵکو فریای نوێژی مزگەوت دەکەوین.

کاوە : ئارەزووی خۆتانە.

بانگی زەردەی کرد، هەر نەهات، پێچەوانەی جاران بوو، لە دڵی خۆیدا وتی دەبێت زویر بووبێ وحەز بەوە نەکات ڕاز وکاوە دەستم بگرن.بانگیکردەوە، وەڕینێکی بۆ کرد و پاشان بە زووترین کات خۆی گەیاندێ، زۆر خۆی پێسوا، ئینجا پەتەکەی خستە نێو دەستییەوە.بڵند گوتی کەس دەستم نەگرێ زەردە پێیناخۆشە.

هەموو پێکەنین، پاشان ڕاز ڕووی کردە زەردە وگوتی ئیرەییمان لێدەکەیت؟زەردە بە چەند مرە مرێك وەڵامی دایەوە.پورە پیرۆز وتی هێندەی نەماوە بێتە قسە.

گەیشتنەوە لای ئۆتۆمبیلەکە، سوار بوون و گەڕانەوە .

پاش مانگێ، دەیویست بچێتە تاران و چاوەکانی چارەسەر بکات، پاشان خوازبێنی ڕاز بکات، بۆ ئەو مەبەستە دەیویست ڕاز ڕازی بکات، چەند ڕۆژێ بوو ڕاز وباوکی نەهاتبوون لەبەر ئەوە بە هیوا بوو ئەو ئێوارەیە دەربکەون.هەروابوو وبە دڵی ئەوبوو، لە دەرگا درا، دایکی چوو بیکاتەوە، ڕاز و باوکی بوون، بەڵام باوکی نەهاتە ژوورێ، گوتبووی دوای نوێژی شێوان دێمەوە.

هەستایە سەر پێ و زۆر خێرهاتنی (ڕاز)یکرد وفەرمووی دانیشتنی لێکرد وگوتی بۆ دیارنین بیرمان دەکردن.

– باوکم زۆر جاران پاش نوێژی شێوان بە درەنگیێ دەگەڕێتەوە، ئەو کاتەش بۆ میوانی درەنگە.
ئێرەماڵی خۆتانە وئێوەمان بە میوان نەزانیوە.
– ئێمەش گەر ئێرە بە ماڵی خۆمان نەزانین هێندە نایەین.
پورەپیرۆز : ئێرە ماڵی خۆتانە، تۆش کچی خۆمی وهەمیشە وەك کچێکم هاوکارم بوویت.
– ئەرکی سەرشانمە. پێم بڵێ، چیی کارت هەیە با بیکەم.
– چ کارم نییە، بەڵام پێشئەوەی باوکت بێتەوە دەمەوێ خۆم بچم چایەك لێنێم.
ڕاز زۆر گوتی دەبێت من بچم، بەڵام پورە پیرۆز نەیهێشت و(لە دڵی خۆیدا دەیگوت تۆ بڵێی ڕاز وەك جاران کوڕەکەمی خۆشبوێ، نابینایی بڵند کاری لە بەڵێنەکەیان نەکردبێت، هەر خۆی دەیگوت زۆر هەستدەکەم یەکتریان خۆشدەوێ، دانیشتنەکانیان وەك جاران دێتە پێشچاو، دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە وگوتی خوایە گیان وەك جاران بن، خوا گیان من ناتوانم بە ڕاز بڵێم بە کوڕم ڕازی بە، بەڵام خوایە وا بکەیت چارەنوسیان پێکەوە بێت).
بڵند حەزیدەکرد لەگەڵ ڕاز سەرێك لە زەردە بدات.هەستایە سەرپێ، گۆچانەکەی دایە دەستی، پێکەوە ڕۆیشتنە دەرەوەی ژوورەکە، هەر کەمێ دوورکەوتنەوە، قۆڵی خستە نێو قۆڵیەوە.
– ڕازەکەم، دەمەوێ پێشنیارێ بکەم، بەڵام نازانم ڕازی دەبیت یا نا؟ من دەمەوێ بڕۆم بۆ تاران تا چاوەکانم چارەسەر بکەم، هەرکە

به چاوساغی گەڕامەوە، بۆ خوازبێنیت دێم، ئەوسا چەند خۆشە بە ویستی خۆم چاوە کاڵەکانت، قژی خاو و باڵای بەرزت ببینم.
– وامدەزانی دەڵێی با زوو بێمە داخوازیت تا پێکەوە بچین بۆ تاران، دڵنیابە هەر خۆم بۆ تاران لەگەڵتدا دێم، تا لە نزیکەوە ئاگادارتبم، دەمەوێ هەرکە چاوەکانت کرانەوە، منی پێببینی. پاش دەربڕینی ئەو قسەیە بێدەنگبوو، بڵند پرسیاری لێکردەوە ، بەلاّم وەلاّم نەبوو، دوو سێجار گوتی ڕاز، ڕاز. بۆ وەلاّم نادەیتەوە. زویر ببوو، بە پەڵمە گریانەوە وتی تۆ دەتەوێ بڕۆی، ئیدی نەیەیتەوە، دڵنیابە ئەمجارە بڕۆی تا دێیتەوە من لە ژیان نەماوم. بەم قسانەی گڕی ئیشقی تێبەردا، لە ناخەوە بۆ قسە ناسکەکانی ڕاز دەسوتا، حەزیکرد زوو ئاشتی بکاتەوە ، چونکە دەیزانی بەرگەی یەك خولەك زویربوونی ناگرێ، لەگەڵ هەنگاونانیان گەیشتنە نزیك ژووری زەردە، زەردە یەکسەر وەڕی، تا زویری لە بیر بەرێتەوە، بە گاڵتەوە گوتی دەزانی زەردە ئیرەیی دەکات، دەترسم ڕۆژێ پەلامارت بدات. هەر بە بێدەنگی مایەوە وقۆڵیشی لە نێو قۆڵی بڵند دەرناکرد، بڵند گوتی تەنیا تۆ زویرمەبە بە خوا بەرگەی زویر بوونت ناگرم، هەرچی دەڵێیت وا دەکەم، هەر سبەینێ لەگەڵ دایکم دێم بۆ خوازبێنیت. هەربێدەنگبوو، بەلاّم توند قۆڵی بڵندی گوشییە خۆی، سەگەکە وەڕییەوە، ئەمجارەیان گوتی پێدەچێت زەردە تێگەیشتبێ و پێی ناخۆش بێت، خۆت بپارێزە با پەلامارت نەدات. هەناسەیەکی

خۆشی هەڵکێشا وئومێدێکی چەندین ساڵەی پێخستە ناخیەوە، چ خەموخەفەتیش هەبوو لەگەڵ هەناسەدانەوەکە دەرپەڕاند و گوتی نا. . نا هێند ساویلکە نیم خۆشی نەویێم.تا زیاتر دڵی خۆشبکات گوتی ڕاز گیان، ئامادەیت گەر سبەینێ لەگەڵ دایکم بێین ولە باوکت خوازبێنیت بکەین.

– بەڵێ ئامادەم وسوورم لەسەر بەڵێنی خۆم. نامەوێ بێ من بۆ تاران بچیت.

دەکەواتە، هەر سبەینێ من ودایکم دێین.توند قۆڵی گوشییە خۆی، سەری خستە سەر شانی، تەزووی خۆشەویستیان تێکەڵ بە یەکدی بوو، لەخۆشی ئەو هەواڵە، لای پەنجەرەی ژووری زەردە وەستان، قۆڵی لە قۆڵیا دەرهێنا بەرانبەری گرت ودەستی ناسکی لە نێو هەردوو دەستینا، بڵندیش دەستەکانی گوشی، پاشان دەستی لەرزۆکی خستە نێو قژە خاوەکەی، پاشان ڕوومەتە ئاڵەکەی دەستی بە فرمێسکی ئاڵوگەشی تەڕبوو.گوتی بۆ دەگری ڕاز گیان بۆ دەگری؟!

– نازانم ...خۆمیش نازانم !!بڵندیش لێشاوی گریان تەنگی پێهەڵچنی، وتی ئەی تۆ بۆ دەگریت.بە نازانم وەڵامی دایەوە.

ژووانێکی بێهاوتابوو، لەرزین و شەرمی هەرزەکاری تیاڕووانەوە.

چەندجارێ دەستی بە برۆکانیدا هێنا، لە تیلی برۆیەوە دەستی هێنایە خوارێ، ڕوومەتی نەرم و ئاڵوناسکی، لەرزۆکی دابووە پەنجەکان، پاشان دەستی گەیشتە لێوی، بە جووڵەی لێوەکانی،

زەردەخەنەی بێوێنەی هاتە پێشچاوی نابینای.ڕازگیان دەزانم بە شـەرمەوە زەردەخەنـەم بـۆ دەکـەیت، دڵـی مـنی مـەلول ونابینـا، فەرامۆش وبە جۆش دەکەیت.بە شەرمەوە وتی بوویتە بە شاعیر.
لـە ئاسـتی جوانی تـۆدا، ئەو جوانییـەی حەقدە ساڵە وەك پـەری ئاسا، وەك خۆیەتی وهیچ نەگۆڕاوە، چۆن نامکات بە شاعیر!!.
دەبێـت ڕۆژێـك بێـت ولـە بـری ئـەم دەسـتانەم چـاوەکانم سـەراپای جوانییت بپشکنن وتێر بن لە بینینی؟!
– دڵنیابە گەر بگەینە تاران، چاوانت چاك دەبن، ئێستێك بێدەنگ و لەگەڵ دڵی خۆیدا دەدوا و دەیگوت(گەر بگەمە ئەویێ بە نهێنیش بێت خۆم دەگەیەنمە دکتۆرەکەی تا چاوێکم بخاتە شوێن چاوێکی بڵند ودونیـای بـۆ ڕوونـاك بکەمـەوە، پاشـان بـا هـەردووکمان بـە چاوێکەوە یەکتر ببینین).
– بیر لە چیی دەکەیتەوە، دڵنیابـە لەبەر دابوونـەریت نـەبێت هـەر ئێستە باوکت گەیشت پێیدەڵێم، کە (من و ڕاز) دەمانەوێ وەك دوو مـەل پێکـەوە هـەڵفڕین وبچـینە سـەر ترۆپکـی بـەرزترین شـاخ لانـە دروستکەین وتا هەتایـە هـەر پێکەوە بژین، ئاخۆ دەبێت سبەینێ کـەی بێـت ولەگـەڵ دایکـم بـێین وخوازبێنیـت بکـەین.پـڕ بـە دڵ ماچێکی نێو چەوانیکرد، لەو کاتـە لـە دەرگـادرا، ڕاز گەڕایـەوە بـۆ لای پـورەپیرۆز، ئـەویش چـوو دەرگـا بکاتـەوە.بـاوکی ڕاز بـوو، سلاوی کرد وهاتە ژوورەوە، لەگەڵ پێی بڵند دەیویست بڕوات بڵند گوتی مامە تۆ فەرموو بڕۆ، من کەمێکم پێدەچێ.
لـە پەنجەرەکـەوە هەنـدێ لەگـەڵ سـەگەکەی قسـەیکرد، بـەزەیی بـە نامۆیی زەردە دەهاتەوە، حەزیدەکرد لـە وڵاتەکـەی جێیهێشـتایە و

بگەیشتایەوە لای هاوڕێکانی و تووشی ئەم ڕۆژەی نەکردایە، بەڵام بەڵێنیدا گەر چاکبووەوە ئەوسا بیگەیەنێتە ولاتی خۆی.

گەڕایەوە بۆ لایان، تا درەنگیێ مانەوە، پاشان بە هۆی ئەوەی باوکی دەرمانەکانی بیر چووبوو، بە ناچاری گەڕانەوە.

ئەوان ڕۆیشتن وخۆی پێنەگیرا یەکسەر دایکی تێگەیاند، پورەپیرۆز وتی زۆر حەزدەکەم، بەڵام دەبێت ڕازی بێت؟

بڵند وتی گەر باوکی ڕازی بێت، ئەو ڕازییە، چونکە ئێمە لە مێژە بەڵێنمانداوە.سبەینێ ڕاز لە چاوەڕوانی ئێمەیە تا بچین بۆماڵیان و لە باوکی خوازبێنی بکەین.

## ( ٤ )

## داخوازی

پوره پیرۆز بۆ یەکەم جاریبوو لە دوای کیمیابارنەکەوە دەستیٚ جلی کوردی جوان لەبەر بکاو وخۆی زۆر بە جوانی ڕیکبخا، لە بڵند پەلەتریبوو، گوتی با کاوە بیٚت ئەوسا دەڕۆین، بەلاٚم ئەو گوتی نا. کوڕەکەم نا با کەس تیٚنەگەیەنین، زۆر بە نهیٚنی پیٚکەوە لە دوای نویٚژی عەسر دەچین، چونکە زۆردەترسم خەڵکی پیٚبزانن کۆسپ وتەگەرە بخەنە کارەکەمانەوە.پورە پیرۆز وبڵند و زەردە، بەرەو ماڵ ڕاز دەچوون، تا گەیشتن چەندینجار ناسیاوەکان لە ڕیٚگەوبانەکان دەیانوەستاندن، بە گەرمی هەواڵیان دەپرسین.

لە دەرگایدا، زۆر بە زوویی لە لایەن ڕازەوە کرایەوە، باوکی تازە لە نویٚژ گەڕابووەوە، هەر لە دوورەوە فەرمووی لیٚکردن.

پاش عەسرە چا خواردنەوە.پورەپیرۆز، وتی کاك مەحمود دەزانی هاتنی ئەمجارەمان تایبەتە؟باوکی ڕاز وتی تیٚناگەم مەبەستت چییە؟

– هاتووین بۆ خوازبیٚنی ڕاز بۆ بڵندی کوڕم.

سەرەتا کەمیٚ حەپەسا، ئیٚستیٚك وەلاٚمی نەبوو، پاشان گوتی گەر ئەو ڕازی بیٚت، من هیچ لاریم نییە، چونکە حەزدەکەم پیٚش مردنم ڕاز ببینم لەگەڵ هاوسەریٚتی وژیانی خۆشە، دەمەویٚ لەمەولا ئاوڕیٚ لە ژیانی خۆی بداتەوە، چونکە چەندین ساڵە لە خزمەتی

مندایە. بڵند: دەستەکانت ماچدەکەم مامە گیان، دڵنیاش بە هەردووکمان هەر لە خزمەتدا دەبین.لەو کاتە ناسکەدا ڕاز هاتە ژوورەوە، باوکی گوتی کچەکەم، ماڵی پوورە پیرۆزت ئەمجارە بۆ کاری خێر هاتوون، ئەویش خوازبێنی تۆیە بۆ بڵند، ئیدی دەمەوێ ڕاشکاوانە وەڵام بدەیتەوەو شەرم نەکەیت، بۆیە ڕووبەڕوو قسەدەکەم تا ئەمانیش دڵنیابن من لاریم نییە وڕازی بوونی تۆ ڕازی بوونی منیشە.
ڕاز بە دەنگێکی پڕ لە شەرم و ڕێزەوە بە باوکی گوت، باوکە گیان چۆنت پێباشە وا بکە.
– پێم باشە تا لە ژیان ماوم دابمەزرێنیت وبە دڵی خۆت هاوسەرت هەڵبژێریت.
– من ڕازیم ولە بڵند ڕێکوپێکتر شووناکەم، ڕاسپاردەی شەهید هەڵۆی برامیش لە یاد ناکەم.
پورە پیرۆز : قوربانت بم ڕاز گیان، دەمزانی هێند بەوەفایت.لای خۆیەوە دەستی بە ماچکردنی ڕاز کرد، شڵپەی ماچەکانی دەنگی دەدایەوە هێند بە تامەزرۆ و خۆشییەوە ماچیدەکرد.بڵند لە نزیك مامیەوە هەستایە سەرپێ و دەستی درێژکرد، تا دەستەکانی مامی ماچ بکات، ئەویش دەستی خستە نێو دەستی و ئەمیش ماچیکرد. پورە پیرۆز : چۆنە هەر ئێستە مەلا بێنین ومارەی بکەین، کاری خێر تا زوو بکرێ درەنگە.
باوکی ڕاز : ئارەزووی خۆتانە.
بڵند : چ مەلایەك بێنین تا ئێستە بە شوێنیدا بچم؟

باوکی ڕاز : پەلە مەکەن، پاش نوێژی شێوان، مەلا محەمەدی مزگەوت ودوو کەسی هاوڕێم دێنم بۆ شایەدی چونکە پێویستە.
پورە پیرۆز : ئەم ئەرکە بدەینە سەر تۆ؟
- بۆ کچ وکوڕی خۆم دەیکەم، جگە لە ئێوە کێم هەیە وکێم ماوە.لە دەرگا درا، بڵند زۆر ترسا کەسێك پەیدا بێت ولەم کاتە ناسکە خۆی بکاتە کەسیان و"ڕیسەکەیان لێبکات بە خوری" بڵێت ئەم پەرییە جوانە بۆ دەدەن بەم کوێرە!!. ڕاز چوو دەرگا بکاتەوە، زۆر بە گەرمی چۆنوچاکی لێکرد وپێیوت کە بێتە ژوورەوە، دڵی زیاتر ترسا ولە دڵی خۆیدا گوتی یاخوا بیرو و بۆ چوونەکەم ڕاست نەبێت، بەڵام لە پڕ خۆشییەك جەستەی خامۆشکرد، هەر لای خۆیەوە وتی ڕاز پێیبڵێ بێتە ژوورەوە، زۆر کارم پێیەتی.
سڵاوی بۆ کردن، هەستایە سەرپێ گوتی کاوە گیان ئەوڕۆ وەك زۆربەی کات بۆمان بوویتە فریشتە.
کاوە :چووم لە ماڵ نەبوون، یەکسەر زانیم لێرەن بۆیە هاتم و یەکەم پرسیارم لە ڕازخان، هەواڵپرسینی ئێوە بوو.
ڕاز وتی گلەیی بێ لێت، گەر ئەمان لێرە نەبوونایە نەدەهاتییە ژوورەوە.وتی من لە خزمەتی هەموو لایەکم، هیچ جیاوازیتان نییە، بەڵام با ئێستە بزانم ئەم برایەم چیی لێمدەوێ تا بە چاوان بۆی بکەم.
- دەمەوێ ببیت بە برا زاوا، پێویستم بە خۆت و ئۆتۆمبیلەکەتە.
- خۆشترین هەواڵت پێدام، بەڵام دەمەوێ بزانم کێیە؟پورە پیرۆز کەوتە پێشیەوەو گوتی ڕازە، هەر ئەمشەو مارەی دەکەین، جا پێویستە تا بازاڕ ماوە بچین و پێویستی چیی هەیە بۆ کاتی مارەکردن بیهێنین.سەرەتا کاوە سەریسوڕما بوو، بەڵام نەیهێنایە

سەرخۆی، گوتی زۆرپیرۆزباییتان لێدەکەم، خۆم وئۆتۆمبیلم لە خزمەتداین، فەرموو با بچین، خۆمیش باشدەزانم چیی دێنم، بۆ شەوێش خۆم دەچم مەلا دێنم ومارەی دەکەین.

پورە پیرۆز :کەواتە ئەو ئەرکە لەسەر شانی کاك مەحمود نەما.

بڵند وتی بەڕاستی ماندووت دەکەین.

– با برا زاوا نەبم وماندوو نەبم. دەفەرموو با بچین بۆ بازاڕ.

شەوێ کۆمەڵێ ناسیاو و هاوڕێیان کۆبوونەوە، (ئیرەیی بە چاویانەوە دیاربوو، بە تایبەت کە ڕازیان بینی بالآیەکی بێوێنە کە کراسە کوردییە ئاوریشمییە هەنارییەکەی پێیبەخشیبوو، چاوە قاوەییە کاڵە گەشەکانی ببوونە جێسەرنجی میوانان بە تایبەت کە ئێستە لە نابینایەك ئەم شۆخە مارە دەکرێ)، مارەیکرد ودەست ماچکردنیش تەواوبوو، شیرینی دابەشکرا.پاش ڕۆیشتنی میوانەکان.هەر خۆیان وکاوە مانەوە.بڵند وتی مامە گیان چ کات دەڵێی تا ڕاز بگوازمەوە؟گوتی ئارەزووی خۆتانە بەلآم حەزناکەم ئاهەنگ وهەڵپەڕکێ بکرێ. بڵند گوتی وا دەزانم هەموو مانگێکە کارەساتی کیمیاباران بووە، چۆن دەتوانم ئاهەنگ بگێڕم، بەلآم نازانم ڕاز چۆنی پێباشە.ڕاز وتی(پێویست ناکات). کاوە وتی بۆچوونەکانتان جوانە.هەر بۆیە بڕیاردرا، پاش کڕینی کەلوپەل، بڵند و ڕاز بە چوونە کەژاوەی هاوسەرێتیان شادبن.

هەفتەی کەژاوەی هاوسەرێتی، سووربوونی بۆ چاکبوونی چاوەکانی پتر کرد، چونکە هیچ کاتێکی ژیانی، هێندەی ئەو هەفتەیە هەستی بە ماندووبوونی دەروونی نەدەکرد، هەر بۆیە بە

ڕازی گـوت، دەمــەوێ مامەڵـەی تـاران بکـەم وپێکـەوە بچـین، تـا چاوەکانم چاکبێتەوە، جگـە لـەوەش مـانگی هـەنگوینیمان لـەوێ تەواودەکەین.ڕاز وتـی زۆر لـە مێـژە چاوەڕوانی ئـەم ڕۆژەم پێکـەوە بچـین بـۆ تـاران، چـونکە دڵنیـام چـاوانت چـاك دەبێتـەوە، بـەلاّم دەمەوێ سبەینێ بچین (تێلەفۆنی مۆبایل و سیم کارت) بکڕین، بۆ هەردووکمان ودایە وباوە.کە بڵند گوتی ئەی ئەم مۆبایلە تایبەتـەم؟ ڕاز وتی دەمەوێ فێری ئەم مۆبایلـە بیـت و دیاریەکیشـە لـە منەوە.
هەر بۆ بەیانی زۆر زوو، قۆڵ لە نێو قۆڵ چوون بەرەو بازێڕ.
لـەوێوە بـەرەو سـەردانی بـاوکی ڕاز دەچـوون، دەرگـای حەوشـی نـەگیرا بـوو، چـوونە ژوورەوە، پێشـئەوەی بچـەنە ژوورەکـەی، بـە دەنگێکـی بـە سـۆز ودڵتـەزێن هـۆرەی دەچـڕی وبـە نـامۆیی ولـە دەستدانی کەسەکان هەڵیدابوو، هـەردووکیانی گریـان ، ڕاز گـوتی هەمیشـە بـەم هۆرەیـەی بـاوکم گریـاوم، ئـازار و ناخۆشـییەکانی دەروونی پێفرێداوم.کـە خۆیـان ئاشـکرا کـرد، لەگـەڵ ڕاز باوەشیان پێکـدا کـرد، بـەکوڵ دەگریـا، ڕاز بـە گریانـەوە گـوتی باوکـە گیـان توخوا مەگری، من تۆم جێنەهێشتووە.
بڵند :مامە گیان، ئێمە کەسی تۆین ولە خزمەتی تۆداین.
دڵـی ئـارامبووەوە گـوتی خۆشـترین سـاتم ئێسـتەیە ڕاز لەگـەڵ هاوسـەریدا دەبیـنم، دڵنیـابووم لـە دواڕۆژی، بـەلاّم ڕاز دەزانـێ هەمیشە بۆ دڵتەنگی خۆم هۆرە دەچڕم.

– مامه گیان، ئێمه چەند ڕۆژێکی دیکه بۆ تاران دەچین، دەبێت ئاگاداری دایکم بکەیت.هەر لەگەڵ خۆیاندا بردیان بۆ ماڵێ.ژمارەی (کاوه وچالاك)یان لە هەر چوار مۆبایلەکه تۆمارکرد.ئەو ڕۆژه ڕاز ببووه مامۆستای هەرسێکیان بۆ فێربوونی مۆبایل.

شەوێ پێوەندیی بە (چالاك)ەوەکرد، زیرەکانە یەکسەر دەنگی ناسیەوەو گوتی لە سبەینێوه مامەڵەی هاتنه ئێران دەنووسین، هەر کاتێ ویستمان دەبێت بێیت بۆ سنوورو هەر خۆت بمانگەیەنیت و لە تاران بۆ باشترین دکتۆری چاو بمانبەیت.

چالاك :نەك ناسین، بەڵکو باشترین دکتۆری چاو هاوڕێمه، هەر کات ویستت، پێوەندیی بکه ومن ئامادەدەبم.

پێوەندیی بە کاوەوه کرد تا بە زووترین کات مامەڵەی ئێران بۆ خۆی وڕاز تەواو بکات.ئەویش لاری نەبوو، دوو ڕۆژ ماوەی پێدان بۆ تەواوکردنی مامەڵەکەیان.

ئەو شەوه بڵند و ڕاز نەچوونه ژووری خۆیان، لای باوك ودایك مانەوه، ئەو شەوەیان بە بەسەر هات وسەرگوزشتەکان بردەسەر.

دوا ڕاسپاردەی بڵند بۆ کاوه(ئاگاداری زەردە بێت)، چونکه ئەوی باش دەناسی.بڵندی بێ خەم کرد وتی جاروبار بە ئۆتۆمبیل پیاسەیشی پێدەکەم.

کاتی ماڵاوابوونی، زەردەی لەبیر نەدەچووەوه کە وەك منداڵ دەنوزایەوه، سەری پیادەسو زانی جێیدێڵێ تا دووریش کەوتنەوه، وەڕینی زۆر بە سۆزی کرد جیاواز لە وەڕینەکانی دیکەی.......زۆر جیاوازتر......

## ( ٥ )

## ( تاران )

له یەکەم بینینی بۆ چالاك، دڵی داخورپا، حەزی دەکرد باوەشی لێبدا وتێر بیگوشێته خۆی، چالاك سەرسوڕمانییەکەی (ڕاز)ی پێ سەیر بوو، بەڵام ئەو دڵی بۆ شتی دیکه دەچوو هەر لەبەر ئەوە زۆر بە ڕێزەوە، دوا تەماشایکرد، ئێدی سەری داگرت وبه هیچ شێوەیێ تەماشای نەدەکردەوە، سەرەتا ڕاز ویستی باسی نەکات کە چالاك زۆر شێوەی بە هەڵۆی برای دەچێت، بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی با چالاك بە هەڵە لێم تێنەگات، ئەو نازانێ هەموو پیاوانی جیهان بە برا ئەزانم وبڵند، بەڵێ تەنیا بڵند هاوسەرمە وحەڤدە ساڵە لە چاوەڕوانیدام.بێدەنگی شکاندو گوتی کاك چالاك هەر کە بینیتم دڵم داخورپا، دوور بێت لە گیانی تۆ زۆر بە شەهید هەڵۆی برام دەچیت.چالاك گوتی سوپاستدەکەم، منیش هەر هەڵۆی براتم.بڵند گوتی قسەکردنیشی بە شەهید هەڵۆ دەچێت ، هەر یەکەم ڕۆژی بینینی ئەوی بیر هێنامەوە.گوتیەوە من براتانم تا هەتایە من لە خزمەتام، داواکارم وەك شەهید هەڵۆ تەماشام بکەن، چیتان ویست بێ بیرکردنەوە بیلێن ومن جێبەجێیبکەم.زۆر خۆشحاڵم کە خوشکی وەکو ڕاز وبرای وەکو تۆم بۆ پەیدابوو.

ڕاز:سوپاسـتدەکەم، هیـوادارم پـاش گەڕانـەوەمان لـە تـاران پەیوەندییمان نەبچڕێ.

- دڵنیابە، لە ئێستەوە بڕیاردەدەین، هاتووچۆی خێزانیمان هەبێ.

ڕاز لـە ئاوێنەکـەوە نەیـدەتوانی جاروبـار تەماشـای نەکات.لـە دڵـی خۆیا وتی (دەنگی وقسەکردنی ، چاوە کاڵەکەی، سوروسپییەکەی، لوتـە خنجیلەکـەی، بـالآی بـەرزی ڕێکـی، لـە هـەمووی گـرینگتر بزەیەکی هەمیشەیی بەسەرلێویەوە، دەڵێـی هـەڵۆی برامـەو زینـدوو بووەتەوە) خوا گیان چەند شێوەیان بە یەکتر دەچێت!!

چالاك کە قسەی دەکرد، ڕاز زۆر بە جوانی گوێی لێدەگرت، چێژی زۆر لـە ئـاوازی دەنگـی وەردەگـرت، (دەیگـوت نـازانم خەونـە یـا ڕاسـتییەو هـەڵۆی بـرام زینـدوو بووەتـەوە).چالاك زۆر ورەی بـەرز کردنەوە، کاتێ دەیوت دکتۆر(شەهرام)، باشترین دکتۆری چاوە و زۆریـش هاوڕێمـە، لـە بـارەی تـۆوە قسـەم لـە گەڵیـدا کـردووە، پێیگووتووم هەموو توانـام دەخەمـە کـار تـا چارەسـەری بکـەم.جگـە لـەوەش گـەر چـاوانت لـە کـار کـەوتبن ئـەوا ڕووانـدن هەیـە، تـۆش دەڵێـی پـارەدارم ئـەوا زیـاتر دڵنیـات دەکـات، چـونکە لـەم ڕۆژەدا هەموو شتێك بە پارە دەکرێ.

شـەو بـوو گەیشـتنە تـاران، بردیانیـە ئـەو ئوتێلـەی کـە هـەر لـە ڕێ بـوون، پێوەنـدیی پێـوە کردبـوون تـا ژوورێکـی تایبـەتی بـۆ بگـرن، زیـاتریش لەبـەر ئـەوەی نزیکـی کلینیکـی دکتـۆر شـەهرام بـوو. گەیشتنە ئوتێل، لـە ژووری ژمـارە (١١٦) ناویـان تۆمـار کردبوون.

چالاك گوتی هەر چیتان ویست بە تێلیفۆنی ئوتێلەکە پێوەندییم پێوە بکەن، سبەینیٚ خۆم دێم وبۆ لای دکتۆرەکە دەچین.
تا لە ژوور چووە دەرەوە ڕاز لە دواوە تەماشای دەکرد پاشان وتی:
بڵند گیان کاك چالاك زۆر بە هەڵۆی برام دەچێت، توخوا پاش ئەم کارانەش نابێت پەیوەندی لێببڕین.
بڵند : بە دڵنیاییەوە.
ئەو شەوە تەواوکەری مانگی هەنگوینی بوو، گوتی :
ڕاز گیان دەبێت، چاوەکانم چاکبنەوە ولەم ژوورەدا بەژنوباڵا وچاوە جوانەکانت بۆ جارێکی دیکە لە ژیانما ببینمەوە؟تۆ نازانی بە نەبینینی چاوە جوانەکانی تۆ چەند ئازار دەچێژم؟!
- بڵند گیان، دڵنیام بەو چاوانەت دەمبینییەوە، بەڵام دەبێت پشوو درێژ بین.

## ( ٦ )

## كلينيك

بـه سـواری ئۆتۆمبیلەکـە نزیکـی چـارەکە کاتـژمێرێکی خایانـد، لـەوێش یەکـەمین کـەس نـاوی نووسـرابوو، سـکرتێری دکتـۆر وتـی (ئێوە دانیشـن، پێـنج خولەکێکـە دکتـۆر گەیشـتووە، پشـوویەکدەدا وقاوەیەك دەخواتەوە ئیدی خۆی زەنگ لێدەدات.

لەگەڵ زەنگ لێدان، دڵیشی زەنگی ترسی نائومێدیی لێدەدا، لـەوە دەترسا وەك دکتۆرەکانی دیکە ئومێدبڕی بکات.ڕاز یش لەو ترسـە بێبـەش نـەبوو، لـە شـوێنی پشـکنین، دکتـۆر بە زمـانی کوردییەکی زۆر پاراو پرسیاری لێدەکرد، نیوکاتـژمێر تـەنیا خـەریکی پشـکنین بوو، سەرەتا چاوی چەپی پاشان چـاوی ڕاسـت، هێڵکـاری تایبـەت بـە چاویشـی بـۆ کـرد، لـە چـاوەڕوانی هـەواڵێکی خۆشـدا بـوون. بێدەنگی دکتۆرەکە زۆر ترساندنی، چالاك خـۆی بـۆ نـەگیرا گـوتی دکتۆر چیی دەفەرمووی، چۆنە چاوی؟!

– دەمـار و گلێنــە و تــۆڕ و بیلبیلــەی چـاوی چـەپی بـە تـەواوی پوکاون وبێکـەڵکن وکیمیاییەکـە سووتاندوونی.تـەنیا دەمارەکـانی چــاوی ڕاســتی، دەتــوانین هەوڵــدەین تــا بــە دەرمــانی زۆربــاش وتایبەت، زیندووی بکەینەوە، پاشان چاوێکی بۆ بڕوێنین ، چونکە

بەشـەکانی دیکـەی لـەکار کـەوتوون، بـۆ ئەمـەش پارەیـەکی زۆری دەویَ، ئیدی نازانم توانایان هەیە بۆ کڕینی ئەو دەرمانـە تایبەتانـە وپاشان هێنانی چاوێکی ساغی کەسێك؟

– دکتۆر گیان، گەر تۆ چاکم بکەیت وببینم، چییت دەویَ ئامادەم، چونکە پارەم هەیە.

دکتـۆر :کەواتـە دەبێـت یـەك مـانگ لـە تـاران بمێننـەوە تـا هەفتانـە بتبینم، هەر هەفتەیەك پاش پشکنین دەرمانی تایبـەتی لای خۆمـت پێدەدەم وڕێنماییەکانت پێدەڵێم، پاش ئەو مانگـە بـە تـەواوی بـۆم دەردەکـەویَ، ئایـا ڕوواندنی چـاوت بـۆ دەبێـت یـا نـا.چـەند جـۆریَ دەرمـانی لـە سـەلاجەکەی پشـت خۆیـەوە دەرهێنـا وڕێنمـایی بـەکارهێنانی پێگـوتن، بـە ڕازی گـوت، زۆر بـە وریـایی و لـە کـاتی دیاریکراوی خۆی بیدەریَ، هەفتەیەکی دیکـە وەرنـەوە بـۆ پشـکنین تا بزانم چەندیَ سوودی وەرگرتووە، تا دەرمانی دیکەتان پێبدەم.

بڵنـد : حەقـدە سـاڵە لـە ئـەوروپام دکتـۆر دەمپشـکنیَ، کەچـی تـا ئێستە هەواڵ وئومێدیکی وەك تۆیان پێنەبەخشیووم.

دکتۆر :پەنا بە خوا، ئێمەش هەوڵێکەو دەیدەین.

چـالاك سوپاسـی دکتـۆری کـرد، وتـی دەمـەویَ باشـترین توانـات بخەیتەگڕ، هەفتانە هەواڵی خۆشمان پێببەخشی.

دکتـۆر: لـە ئێـوە زیـاتر حەزدەکـەم نەخۆشـەکانم چارەسـەر بکـەم.

ماڵاواییان کرد و گەڕانەوە ئوتێل.

ئەو شەوە پێوەندییان بە کاوە و دایکو وباوکەوە کرد تا ئومیدیش بەوان بدەن.

## ئەنجامی پشکنینی هەفتەی یەکەم

پاش پشکنین وتی بە ڕێژەی٢٠٪سوودی لەو دەرمانانە وەرگرتووە. دەرمانی دیکەی پێدان، لە کلینیکەوە بە پیاسەوە بەرەو ئوتێل گەڕانەوە وتی ڕاز گیان گەر تۆ لەگەڵمدا نەبوویتایە، چییم بکردایە؟

– تۆ دەتویست بە تەنیا بێیت، دەمزانی تەنیایی بۆ ئەم شوێنانە نابێت، هەر بۆیە سووربووم لە سەر ئەوەی پێکەوە بێین.

## ئەنجامی پشکنینی هەفتەی دووەم

پشکنینی ئەمجارەیان زۆری خایاند، ترس گرتبوونی کە لە ناکاو بڵێت بێهوودەیە.بەلاّم دڵیخۆشکردن، ڕێژەی ٣٥٪ بە زیندوو بوونەوەی دەمارەکانی پێدان، ئەمجارەیان جگە لە دەرمان، چەند جۆرێك لە خواردن و وەرزشی تایبەتی چاوی بۆ دانا.هەر لای خۆی وەرزشەکانی پێکرد و پاشان گوتی ئەم هەفتەیە ڕۆژانە بەم شێوەیە، وەرزش بە چاوەکانت بکە.

ئەو ڕۆژە داوای لە چالاك كرد بیانگەیەنێتە كۆمەڵەی نابینایان.
چوونە پرسگە، فەرمانبەری پرسگەكە تا ژووری بەڕێوەبەر بردنی.
بەڕێوەبەر پێشوازییەكی گەرمی لێكردن.
بەڕێوەبەر چوارشانەیەكی بالآبەرزی كەتەبوو، چاوێكی بە كزی دەیبینی وچاوێكیشی شوشە بوو، ناوی(حیكمەت) بوو، فارس بوو بەلآم كوردییەكی باشی دەزانی، پێیگوتن بە هۆی تێكەڵی لەگەڵ نابینایانی ناوچە كوردنشینەكانی ئێران و نابینایانی كوردستانی عێراق كوردییەكەی باشە.گوتیشی (دە)ساڵە، بەڕێوەبەری كۆمەڵەی نابینایانە.
بڵند:ماوەی ئەم دەساڵە، كەست بینیوە چاوێ ساغیان بۆ ڕواندبێ؟ بەڕێوەبەر :چەندین كەس هەبووە، بەلآم دەوڵەمەند بوونە و بە پارەیەكی زۆر باش چاویان كڕیووە.
– سەبارەت بە پارە، سوپاس بۆ خوا پارەدارم، بەلآم لەو بڕوایەدا نیم جارێكی دیكە چاوم بە ئاسانی ببینێ، گەرچی دكتۆر شەهرام ئومێدێكی پێبەخشیووم.
بەڕێوەبەر: باشترین دكتۆری چاوە، بۆ منیش چاوێكی شوشەی بۆ دانام تا هاوتای چاوە ساغەكەم بێت، كەم كەس دەزانێ چاوێكم شوشەیە، زۆریش هاوڕێمە چونكە زۆربەی ئەوانەی كە چاویان ناساغە وپرس بە ئێمە دەكەن بۆ لای كام دكتۆر بچن، بە ناوی كۆمەڵەكەمانەوە نوسراوێكی بۆ دكتۆر شەهرام پێدەدەین.ئەمجارە چوون پێوەندیم پێوەبكەن، كارتێكی ئەدرێسی خۆی پێدان وتی

پەیوەندی بەم ژمارەیەوە بکەن تا بە خۆم بێم، تا لەگەڵ چالاک زیاتر وا بکەین چارەسەری باشتر و ئومێدی باشترمان پێببەخشێ.

## ئەنجامی پشکنینی هەفتەی سێیەم

ئەمجارە لەگەڵ بەڕیوەبەر چوون، نۆرەیان هات بۆ چوونە ژوورەوە، لەگەڵ دکتۆر باوەشیان لێکداو زۆر بە گەرمی وچەندجارێ دەنگی لێدانی شڵپەی دەستیان لە سەر شانی یەکدی دۆستایەتیانی زیاتر سەلماند.کە پرسی چاوت چۆنە؟!ڕێنماییەکانت جێبەجێ کرد.ڕاز وەلامی دایەوە دکتۆر زۆر بە باشی ڕێنماییەکانمان جێبەجێ کردووە.

بەڕێوەبەر:دکتۆر، دەمەوێ زۆرباش بیپشکنی، ئەمانە خۆشەویستی منن.

دەستی بە پشکنین کرد، چەندجارێ لەسەر یەکدی گوتی ماشەڵلا، ماشەڵلا زۆرباشە.دەتوانم بڵێم ٨٠٪ بەرەو پێش چووە، بەلام دەمەوێ لەسەر دەرمانەکان و وەرزش کردنەکە بەردەوامبیت وئەم هەفتەیە دووجار بێیت تا باشتر ئاگاداری و ڕێنماییت پێبڵێم و بڕیاری ڕواندنی چاوێ ساغت پێبدەم.پاش پشکنین و وەرگرتنی دەرمان، بە هۆی چاوەڕوانی نەخۆشەکانی دیکەوە لە نۆرەکانیان، مالاوایيان لە دکتۆر کرد، کە چوونە دەرەوە چالاک لە چاوەڕوانی بوو، گەڕابووەوە لەو کارەی کە بە هۆیەوە نەچووبوو لەگەڵیان.

دوا قسەی بەڕێوەبەر (هەرکات پێویستت بە چاوی ساغ بوو پێوەندییم پێوە بکە، تا بە هەر شێوەیەك بوو پەیدای بکەین).

## ئەنجامی پشکنینی هەفتەی چوارەم

ڕۆژی دوو شەممە سەردانییان کردوپاشان ڕۆژی پێنج شەممەی ئەو هەفتەیە، پاش پشکنینێکی ورد ودرێژخایەن، بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە، گوتی(ئێستە دەتوانم پێتان بڵێم چاوێکی ساغ بۆ ڕواندن پەیدا بکەن، چاوەکەی دیکەشت شوشەیەکی وەك ڕەنگی ئەو چاوەی بۆتی دەڕوێنم دایئەنێم، کەس هەستی پێنەکات شوشەیە).

بڵند بە دەنگیٚ لەرزۆکەوە (پاش نەشتەرگەرییەکە، دەبیٚ ببینم ؟!)

دکتۆر :بۆ نا، تۆ نە یەکەم کەسی چارەسەرم کردبیٚ ودونیام بۆی ڕووناك کردبێتەوە، نە دوا کەس دەبیت.

ڕاز:دکتۆر ئێستە ئێمە چیی بکەین؟

- لەئیمڕۆوە، چ لە لایەن خۆتانەوە یا کۆمەڵەی نابینایانەوە، چاوێکی ساغ پەیدا بکەن.

ڕاز :دکتۆر، دەمەویٚ هەر ئێستە نەشتەرگەری بۆ هەردووکمان ئەنجامبدەیت، چاوی ڕاستی من دەرهێنی وبیخەیتە شوێن چاوی بڵند.دوو چاوی شوشە بۆ هەردووکمان دابنێی.

پێشئەوەی دکتۆر وەڵامبداتەوە بە پەلە وبە شپرزەییەوە گوتی: زۆر ئەستەمە بێڵم کاری وا بکەیت، من پارەم هەیە وچاوێك دەکڕم.

ڕاز :ئێمە هاوسەرین وتا مردن پێکەوە دەبین، جا چاوی من بێت لە چاوی یەکێکی دیکە باشتر نییە؟
بە تووڕەییەوە گوتی نەخێر باشتر نییە.
دکتۆر :ڕازخان تۆ بەوەفایی خۆت نواند، بەڵام کاکە بڵند ڕاست دەکات دەڵێت پارەم هەیە وچاوێك دەکڕم.
ڕاز :ئەو کات بەوەفام چاوێکم دەربهێنرێ وبخرێتە جێی چاوی.
دکتۆر : گەر نەشتەرگەریتان بۆ بکەم، ئێستە هەرناکرێ وچەند ڕۆژێکی دیکەی دەوێت، کێ ئەڵێ چاوی تۆ دەبێت، ئێستە دەتوانن بڕۆن وبیری لێبکەنەوە، پاشان وەڵامم بدەنەوە، لەسەر من سەرکەوتنی نەشتەرگەرییەکەیە.
قۆڵ لە نێو قۆڵ لە کلینیکەوە بەرەو ئوتێل دەڕۆیشتنەوە، بەڵام قسەی لەگەڵ نەدەکرد.گەیشتنە نزیك ئوتێل.بڵند گوتی بۆ بێدەنگی دەڵێی زویربووی؟وەڵامی نەدایەوە، بەڵام ئەو بەردەوام بوو، گوڵەکەم چۆن دێڵم چاوی جوانی تۆ هەڵبکۆڵن.
بە توڕەییەوە وتی ئەی ئێمە هاوسەرنین، تا مردن پێکەوە ناژین.
زانی توڕەیە، بێدەنگبوو تا چوونەوە ژووری خۆیان.هەر کە دانیشت گوتی ڕاز گیان، لە پێناو بینینی چاوە جوانەکانی تۆ نەبێت، پێویست ناکات چاوم چاکبکەمەوە، تۆش دەتەوێ لە بینینی ئەو چاوە جوانانەم بکەیت؟
دیسانەوە وەڵامی نەدایەوە، هەستی لێڕاگرت، گوێی لە لووشمە وپەڵمەی گریانی بوو.بە پەلە بۆ لای چوو، بەڵام پێیهەڵکەوت وزۆر

بە خراپی کەوت.خۆی گەیاندێ ودەستی گرت و پێکەوە هەستان، بە دەنگی پڕ سۆز و بەزەییەوە گوتی تکات لێدەکەم بهێڵە سبەینێ نەشتەرگەریەکەمان بکرێ تا ڕزگارت بێت.

گوشییە خۆی، ئەویش بەسەر سینگییەوە هەنسکی دەدا، نێو چەوانیی ماچکرد گوتی کۆمەڵەی نابینایان وچالاك ودکتۆر هەوڵمان بۆ دەدەن لە پەیداکردنی چاوێکی ساغ، ئیدی بۆ دەستکاری چاوی جوانی تۆ بکرێ.

– دەمەوێ بە چاوی یەکێکی دیکە نەمبینی وبە چاوی خۆم بمبینی.

– هەرگیز نایەڵم چاوی تۆ بخرێتە شوێن چاوی من، دەربڕینەکەی تووڕەیی پێوەدیاربوو.

دیسانەوە خۆی دوور خستەوە ودەگریا.ئەویش لە دوورەوە قسەی بۆ دەکرد تا دڵی بداتەوە، وتی گوڵەکەم، دڵی خۆت تەنگ مەکە، ئێمە دەست لە نێو دەست بۆ هەموو شوێن دەچین، تەواوکەری یەکدین، جا ئەو چاوە جوانانە چ لای تۆ بێت وچ لای من بێت هیچ جیاوازی نییە، گرینگ ئەوەیە ڕێنیشاندەری وهەمیشە پێکەوە دەبین، یا تۆ حەز ناکەیت پێکەوە بۆ هەموو شوێن بچین؟ وەڵامی نەبوو.

خۆی گۆڕی وجلی نووستنی لەبەرکرد وچووە سەر جێی نووستن وگوتی توخوا دڵم مەشکێنە و وەرە سەر جێی نووستن.نەیتوانی دڵی بشکێنێ، بەڵام پشتی تێکرد.

- دوور مەکەوە وپشتم تێمەکە، نەڵێی چاوی نابینیٚ، دڵنیابە چاوی من تەنیا تۆ دەبینیٚ.ئێستە ئەو چاوە جوانانەم بدەریٚ.
بە پەلە لێیهاتە پێشەوە وتی دەبا ئێستە پێوەندیی بە دکتۆرەوە بکەین وبڵێین بڕیارماندا سبەینیٚ ئامادەبین بۆ نەشتەرگەریی.
- بە هەڵە تێگەیشتی ونەتهێشت قسەکەم تەواو بکەم، من دەڵێم ئەو چاوە جوانانەم بدەریٚ تا تێر ماچیان بکەم و بە چاوە پووکاوەکانم بیانبینم.
چەند شەپێکی لەسەر سینگیدا، بڵند باوەشی پێدا کرد وکردیە گاڵتەو گەپ لەگەڵیدا، وتی چۆن دڵم دێت دەستکاری ئەو چاوە جوانانە بکریٚ، من دەمەویٚ ڕۆژێك بیٚ ولەسەر ئەم جێگەیە تێر تەماشای چاوەکانت بم.ئەو شەوە چەندینجار زویر دەبوو ولێی دووردەکەوتەوە، هەموو جارەکانٚ قسەی بۆدەکرد و دەیویست واز لەو بیرۆکەیە بێنیٚ.دواجار گوتی گەرهێند لە دڵ خۆشەویست نەبوویتایە ڕازی دەبووم.
- من تۆم خۆشناویٚ..
- من تۆم زۆرخۆشدەویٚ، بەڵام ئەوڕۆ پتر، مەگەر وەلی هێندە شەمی خۆشویستبیٚ.
- من شەم نیم.
- دەزانم تۆ (شیرین)ی و من فەرهاد.
- شیرینیش نیم.

– زۆر ڕاستە، داستانی دوو ئیشقی پاکوبێگەردی دیکە لە کوردەواریمان زیادی کرد ئەویش (ڕاز وبڵند).
ئەمجارەیان کەمێ پێکەنی وگوتی پێم بڵێ.
– گیان، قوربانی پێکەنینەکەت بم، چییت پێبڵێم؟
– بە چیی دەتوانم لە هەقت بێم و لێت بەرمەوە؟
– کاتێ چاوم چاکبوو، زۆر لێمنزیکبکەوەرەوە تا تێر تەماشای چاوەکانت بکەم، ئەوسا بە تیلی ئەو چاوە جوانانەت دەمکوژی ودەیبەیتەوە.
سۆزی خۆشەویستی وبەزەیی تەنگی پێهەڵچنی ولێینزیکبووەوە ودەستی خستە نێو دەستی وبە دەنگێکی نەرم ونەوی گوتی تۆ هێند منت خۆشدەوێ؟
– دەتوانم بڵێم بێ تۆ ژیانم ناوێ، گەر تۆ نەبی چاویشم ناوێ، من پێویستم بە چاوێکە تا چاوە جوانەکانی تۆی پێببینم، تۆش دەڵێی چاوم هەڵکۆڵن.دەستی لە ملی کرد وئیدی بێدەنگبوو.
وێڕای ئەو هەواڵە خۆشە، نەیانتوانی پێوەندیی بە کەسەوە بکەن، بەڵام چالاك پێوەندیی پێوەکردن وگوتی پیرۆزباییتان لێدەکەم بە بۆنەی دوا بڕیاری دکتۆر شەهرام، چونکە پێوەندییم پێوە کرد وگوتی دەتوانم چاوی بۆ بڕوێنم، خەمتان نەبێت یەك کاتژمێری دیکە دەگەمەوە تاران، بەیانی زوو سەردانیتان دەکەم، چونکە زۆر ماندووی ڕێم ودەبێت بچمەوە بۆ شوێنی خۆم لای شوفێرەکانی هاوڕێمسبەینێ یەکتر دەبینین.

بە ڕازی گوت تەماشای بکە چەند دڵسۆز وبە وەفایە، چاوێکمان بۆ پەیدا هەردەکات، ڕاز گیان، تۆ بۆ وا هێندە پەلەتە، لەسەرخۆ، بەو هاوڕیێ دڵسۆزانە کارەکەمان جێبەجیێ دەبێت.

- پرسم پێمەکەو بە ئارەزووی خۆت بکە.دیسانەوە قسەکانی بۆن تووڕەبوونی لێدەهات، لە ئامێزی گرتەوە، زویر بوونەکانی ڕاز لەو شەوەدا، توڕەبوونەکانی، ببووە شنەبای خۆشەویستی، وەفا وئیشق، دڵی گەرم و خوێنی ئاڵودە بەو ئیشقەیانی فێنك دەکردەوە، هەموو دەستلەملانێی ئەو شەوەیان، ئەشکە بارانبوو، داری ئیشق وخۆشەویستییانی ئاودەدا.

بەیانی درەنگ بە ئاگاهات، دەستی گێڕا، ڕاز لە شوێن خۆی نەما بوو، چەند جاریێ بانگیکرد وەڵام نەبوو، گوتی دەزانم زوویر بوویتە، بەڵام دڵنیابە دڵم نایەتێ چاوی تۆ بەکاربێنم.هەر دەنگ نەبوو، زیاتر هەستی ڕاگرت هیچ دەنگی گویێ لێنەدەبوو، لە پڕ زەنگی تێلێفۆنەکە لێدرا، خۆی گەیاندیێ وهەڵیگرت، چالاك بوو، بەیانی باشی کرد و گوتی دەزانی ڕازخان بەیانی تێلێفۆنی بۆ کردم تا بە زووترین کات بیگەیەنمە لای دکتۆر شەهرام بۆ ئەوەی بە نهێنی نەشتەرگەری بۆ بکات وچاوێکی دەرهێنیێ پاشان پێوەندیی بە تۆوە بکریێ، (ئێستە لە نێو ئۆتۆمبیلەکەم دایە، زۆر توڕەیە ودەڵێت دەبێت بچین بۆ لای دکتۆرێکی دیکە، دکتۆر شەهرام ڕاست ناکات کە دەڵێت (چاوی تۆ لە قەبارە زۆری جیاوازە، خوێنتانیش جیاوازە هەروەها تۆ بەرگەی نەشتەرگەری

نــاگری وزۆر تەنگەنەفەســی)، وا بــە فێڵــی کەلوپــەل کــڕین لای پێشانگەیەك وەستام ولە نێو پێشانگەکەوە قسەت لەگەڵ دەکەم ، چونکە پێیگوتم نابێت بڵند بزانیٚ.

زۆر ترسا، بە سەرسامیەوە گوتی بە هەر ڕێیەکە بیهێنەوە.

چالاك :هیچ خەمت نەبیٚ وپێی ناڵێم پێوەندیم بە تۆوە کردووە، تەنیا دەڵێم دەبێت بچینەوە تا دکتۆرێکی باش دەدۆزمەوە.

بە نێو ژوورەکەدا هاموشۆی دەکرد وزۆر دڵی دەترسا باوەڕ بە چالاك بێنیٚ وبە زۆر بیبات بۆ لای دکتۆرێکی دیکە، بەڵام دڵی هێوور دەبووەوە کە چالاك دڵنیای کردەوە، لەبەرخۆیەوە دەیگوت گەر بێتەوە دەبیٚ لێی تووڕەبم، بەڵام هەر خۆی وەڵامی خۆی دەدایەوە ودەیگوت ئەو لە پێناو مندا وا دەکات، ئەو چووە چاوێکی هەڵکۆڵیٚ بۆ من، چۆن دەبێت لێی تووڕەبم!!زۆر لە چاوەڕوانیی بوو، چەندینجار بە نێو ژوورەکە دەخولایەوە، بەڵام هەر نەهاتنەوە، زۆر ترسا باوەڕ بە چالاك بێنیٚ و بچێتە لای دکتۆرێکی دیکە وخۆی بخاتە ژێر نەشتەرگەرییەوە، ئەوسا کارلەکار دەترازیٚ. ئەو ترسە گیانی تەزاند، نەیدەزانی چیی بکات، دەیویست دابەزیٚ و بە دوایاندا بچێت، بەڵام زۆری نەخایاند لە دەرگایاندا، دەرگای کردەوە، چالاك باوەشی پێدا کرد وگوتی زۆر بیرم دەکردی ، بەڵام چوونەوەم بۆ مهاباد زۆر پێویست بوو، گەرنا جێم ناهێشتن.

– سوپاس چالاك گیان، لەمەولا كارمان پێت دەبێت.ڕووی كردە ڕازو گوتی بۆ ڕاز گیان بۆچی؟چالاك وەڵامی دایەوە وگوتی ڕازی خوشكم وەفای خۆی نواند، دڵنیابە لەوڕۆوە هەوڵەدەم چاوێكی ساغتان بۆ پەیدا بكەم، چونكە چاوی ڕازخان بۆ چاوی تۆ نەدەبوو. ئێستە دەبێت بمبەخشن، ناتوانم دانیشم چونكە هاوڕێیان چاوەڕوانن. ڕۆیشت....

– ڕاز گیان، ئەم بەیانییە بۆ وات لێكردم؟بەڵام تازە چیی بوو بوو، ئەوەی لای من گرینگە دڵنیابوونی تۆیە، چونكە چاوی جوان وگەورەی تۆ بۆ من نابێت، من چاوێكی ناشیرین وبچووك، تۆ چاوێكی گەورەی ئاسك ئاسا.

– باوەڕ ناكەم، بۆچ چاوی من نابێ؟كاتی خۆی چاوی تۆ هێند جوانبوون، هەر بە چاویشەوە بوویتە بۆیە كیمیایەكە كاری لە چاوت كردووە.

– بڕیاری دكتۆرە ونكۆڵی لێناكرێ، چالاك گفتی پێداوین دەیباتە سەر.دە ئێستە خۆت ئامادە بكە وا نزیكی نیوەڕۆیە نانی بەیانی بخۆین، پاشان پیاسەی نێو تاران بكەین.

لەگەڵ ڕاز بە نێو بازێڕی تاران دەسوڕانەوە، لە پڕ ڕاز گوتی بڵند، سەگێ بە دەست ئەو پیاوەوەیە زۆر بە زەردەی خۆمان دەچێت.

– ڕاز گیان برینت كولانمەوە، خۆزگە لەگەڵ خۆم دەمهێنا، چونكە دەزانم ئێستە زۆر بێزار ومەلوولە، زۆرجار پەلاماری عودەكەی دەدام ودەیهێنا، دەیزانی بە ئاوازەكان دڵارام دەبمەوە.بیرۆكەیەك

بە مێشکیدا هات وگوتی ڕاز گیان بزانە ناپرسی فرۆشتنی ئامێری عود لە کوێ هەیە.

– خۆزگە عودەکەمان لەماڵەوە دەهێنا، ئێستە پرسیار دەکەم.

لاوێکی گەنج، باڵا بەرزی سوروسپی، قژ درێژ، شوێنەکەی پێگوتن. پێشانگەیەکی تایبەت بە جۆرین میوزیکی کۆن وسەردەم بوو، پرسیاری باشترین عودی کرد، جۆرێکی ئیتالی پێدا، ئەویش هەر لەوێ ئاوازی گۆرانی (ئەگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەم) ی (مەزهەری خالقی)ی پێلێدا.

نەك هەر ڕاز، خاوەن پێشانگەکەیش سەریسوڕما، هەر لەبەر ئەو زانینەی زۆر لە نرخەکەی بۆ داشکاند.

ڕاز : ئەمە لە کوێ فێربووی؟!

– ڕاهێنەرەکانی میوزیك لە کۆمەڵەی نابینایان فێریان کردم.

ئەو شەوە ڕاز لە ئاوازەکان تێر نەدەبوو و زۆرجار گۆرانییەکەیان پێکەوە دەچڕی، جاری ئاوازێ کۆنی دەهاتەوە یاد و دەستیان پێ دەکردەوە، هەموو ئەو ئاوازانە یادە خۆش و ناخۆشەکانی دەهێنایە میوانی ئەو شەوەیان، ئەو ئاوازانە ببووە لایلایەی ئەو شەوە، ئارامی دەبەخشییە دڵودەروونی پڕ خۆشەویستی و ئێشقیان.

دواجار ئاوازێکی لێدا وتی ئەم ئاوازە زەردە زۆر چێژی لێدەبینێ، گەر شەو درەنگی نەکردایە پێوەندیم پێوە دەکرد وبەم ئاوازە دڵیم هێوور دەکردەوە، بەڵام بەیانی بۆی دەکەم.

ئاوازی هۆرەکەی باوکی ڕازی لێدا، ڕاز بە هێمنی فرمێسکی لە چاوان دەباری وحەزی نەدەکرد بڵند بزانێ نەوەکو واز لە لێدانی ئەو ئاوازە بێنێ، تێر دڵی خۆی بۆ باوکی شۆرییەوە..............

## ( ٧ )

## پەیوەندیی بە سەگەکەیەوە

پەیوەندی بە (کاوە)وە کرد، سێ ڕۆژ بوو پێوەندییان بە یەکەوە نەکردبوو، وتی گەر بە ئەرك نەبێ سەردانی زەردە بکە وبڵندگۆی مۆبایلەکەت بکەرەوە وتا گوێی لە دەنگم بێت، چونکە زۆر بیری دەکەم.

کاوە : زەردە کەمێ ناساغە، منیش حەزدەکەم قسەی لەگەڵ بکەیت دڵنیام ئەویش بیرت دەکات، وێڕای ئەوەی زۆر هاوڕێمە وهۆگرم بووە، بەڵام لەو باوەڕەدام بەهۆی دووری تۆ و وڵاتەکەیەوە نەخۆشە، هەر ئێستە دەچم بۆ لای، کە گەیشتم خۆم پێوەندییت پێوە دەکەم.

زۆری پێنەچوو کاوە پێوەندییکرد گوتی ئێستە لە ماڵتانم، دایکت زۆر سڵاوی هەیە و دەڵێت دەبێت کەی بێنەوە

- کاوە گیان دوا بڕیاری دکتۆرم پێگوتوون، ئیدی ڕۆژێ زووتر چاوێکی ساغم چنگ بکەوێ، ڕۆژێ زووتر دەگەینەوە.

کاوە ڕووی مۆبایلەکەی لە زەردە کردبوو، بڵند دەیگوت زەردە زەردە، سەرەتا هێندێ نوزەی بۆ کرد، چەند جارێ دووبارەی کردەوە، ئەمجارەیان دەنگی ناسییەوە، وەڕی، بەڵام دەنگی دانوسا

بوو.بڵند دڵی پڕبوو، ڕاز چەندجارێ بانگی کرد، بۆئەویش جاروبار دەنوزایەوە وهێندێ جار دەوەڕی، بڵند گوتی کاوە گیان بزانە دکتۆری ڤێتەرنەری بۆ ناهێنی تا چارەسەری بکات، هەستدەکەم زۆر نەخۆشە، مۆبایلەکەی لێنزیکبکەرەوە، پێشەکی با خۆمیش ئەم دەرمانەی بۆ بنێرم، دەستی دایە عودەکەی، ئەو ئاوازانەی لێدا کە زەردە بە دڵی بوو، هەر نوزە نوزی بوو، پاشان کاوە گوتی بە ڕاستی دەرمانی باشت بۆی نارد، کپ وبێدەنگ، لە پاڵکەوتن کەوتوو قنجی داوەتەوە وتەماشای مۆبایلەکەم دەکات، هەستی تەواوی ڕاگرتووە، جاروبار چاو لێکدەناو دەیپروکێنێ، لەگەڵ ئاوازەکان کەوتووەتە نێو دەریای خەیاڵی تایبەتی خۆیەوە، لە ژیانمدا یەکەم جارە سەگی لەم شێوەیە ببینم، دوا ئاوازی لێدا و تەواوبوو.

کاوە :پێدەچێ پێینا خۆش بێت وازت هێنا، چونکە هەستاوە وچاوەکانی کردووەتەوە، ڕووی لە شوێندەنگی مۆبایلەکەیە.

بڵند وتی زەردە، تەواو، ئاگاداری خۆت بە.. باش؟

کاوە :زۆر باش تێتگەیشت، پاڵکەوتەوە وتەماشای مۆبایلەکەی نەکردەوە.

سوپاسی کاوەی کرد وکۆتاییان بەو پێوەندییە هێنا.

( ٨ )

## چاوێکی ساغ

بەیانی زۆر بە زوویی چالاك پێوەندیی پێوە کردن وگوتی چاوێکم پەیدا کردووە لە کوڕێکی ئەفغانی، گەر حەزدەکەن هەر ئێستە کوڕەکە لەگەڵ خۆم دەهێنم.

لە خۆیەوە دڵەکوتێیەکی چاوەڕواننەکراوی توشبوو، هەستیدەکرد تاوانێکەو ئەنجامی دەدات، بەڵام گوتی بیهێنە، ئێمەش سوپاست دەکەین ولە چاوەڕوانیداین.

کوڕێکی ئەفغانی لەگەڵیدا خۆیانکرد بە ژوورا، سڵاویان کرد، (ڕەشتاڵە، دوو چاوی ڕەشی بە قوڵا چوو، باڵای لاواز ودرێژ، جلی ئەفغانی لەبەردابوو)پاش هەواڵپرسین ویەکترناسین، بۆی دەرکەوت ناوی(عەبدولرەحیم)ە، زمانی کوردی دەزانی.

سەرەتا بێدەنگ، وەك بەرانبەر دادوەر وەستابێت وابوو، بێدەنگییەکەی بۆن کرووزی هەژاریی لێدەهات، بە تەواوی هەستی پێدەکرا، هەر بۆیە بە سۆزەوە پێیوت براکەم، تۆ چاوی خۆت بۆ دەفرۆشی؟

– دەیبەخشم نایفرۆشم، دەمەوێ کارێکی مرۆڤانەت لەگەڵدا بکەم.

– تۆ کەسی من نیت وتەنانەت لە یەك نەتەوەش نین، ئیدی بۆ بەم

کاره هەڵدەستی؟لەگەڵ دەربڕینی هەر وتەییٚ، هەستت بە لەرەی وشەکان دەکرد، لە قورگێکی پڕ لە گریانەوە، لە ناخێکی پڕ ناسۆرەوە سەرچاوەی گرتبوو، کاتیٚ دەیوت(دەمەویٚ ڕوناکی بە مرۆڤێك ببەخشم)، کە بڵند گوتی هیچ کەسێکت، هاوڕێیەکت ئەم کارەی کردووە بووبێتە هاندەریٚ بۆ تۆش؟لە ئاستی ئەم پرسیارەدا ئاهێکی لە ناخەوە هەڵکێشا وتی هاوڕێکانم پێیان گوتووم، گەر پێیانگوتی بۆچ ئەندامی لەشت دەبەخشی، بڵیٚ بۆ کارێکی مرۆڤانە، بەلاٚم ئەوی ڕاست بێت، من خاوەنی دوازدە سەر خێزانم، ( قورگی پڕ گریانی، ئێستێك بێدەنگی کرد، چەند دڵۆپیٚ فرمێسك، گرێی وشە ڕاستی وبە سۆزەکانی کردەوە) وتی:
لە هەرە هەژارەکانی ئەفغانستانین، بە فرۆشتنی ئەندامێکی لەش هیچمان لێنایەت وپارەکەی بۆ خێزانەکەم هەواڵە دەکەم تا لەو ژیانە قوتاریان بکەم.
- بە چەند دەیفرۆشی؟
- لە بازاڕ کەمتر.
- بۆ بازاڕی ئەندام فرۆشی هەیە؟
- بەڵێ، دەردی هەژاریی ئەو بازاڕەی زۆر گەرم کردووە.
بڵند ئێستێك بێدەنگی گرتی(خۆی وەك مرۆڤێکی دڕندە دەهاتە پێشچاو کە پەلاماری یەکێك دەداو چاوی هەڵدەکۆڵیٚ، بە خۆی دەگوت چیی جیاوازیم لەگەڵ ئەو مرۆڤە دڕندانە هەیە ڕووناکییان لێدزیووم، نا نەخێر کاری وا لە من ناوەشێتەوە، من مرۆڤم

خۆشدەویٚ).تەزووییٚ، سووروسپییەتی ڕوخساری زەرد هەڵگەڕاند وهەموویان بە ئاشکرا هەستیان پیٚکرد.بە تەواوی تیٚکچوو وگوتی:
نا. . نا زۆر ئەستەمە کاری وا بکەم، ویژدانم ڕیٚم پیٚنادات،
مـــن مـــرۆڤم ودڕنـــدە نـــیم. ئەفغانییەکـــە زۆری پیٚناخۆشـــبوو، دەپاڕایـــەوە ودەیگـــوت توخـــوا، گـــەر دەتـــەویٚ ژیـــانی خیٚـــزانم لـــە هـــەژاریی ڕزگـــار بکـــەیت، ئیٚســـتە بڕیـــار دەدەیـــت تـــا بچـــمە نەشتەرگەرییەوە وچاویٚکم بۆت دەربیٚنن.
– تـــۆ زۆر بـــە ئاســـانی وا دەڵیٚـــی، خـــۆمیش نەمـــدەزانی بڕیـــاری وا هیٚند گرانە، (ئەندامی کەسیٚك بە پارە بکڕی!!)، ئای خـوا گیـان بـۆ دەبیٚـت مـرۆڤ هەنـدیٚکی بـەم شـیٚوەیە بـژیٚت، بۆچـی نابیٚـت مرۆڤ بە یەکسانی بژیٚت؟!بیٚدەنگی ژوورەکەی خامۆشکرد، ئەفغانی وەڵامـی پرسـیارەکانی زۆر بـە گرانـی لـە زار دەردەچـوون، نەیـدەتوانی بـە ئاســـانی وەڵامـــی کەســـیٚك بداتـــەوە، (نامرۆڤیٚـــتی. . چلیٚســـی. . خۆپەرسـتی وا دەیسـوتیٚنیٚ، میٚشـکی دەهـەژیٚنی وئارەقی شـەرمی نامرۆییـەتی لـە نیٚوچەوانییەوە، دەچـۆڕیٚنیٚتەوە).ویٚـڕای ئـەوە، لـە لایـەکی دیکـەوە، چاوی گەشـی کۆرپـەکانی بۆ پـاروە نانیٚك تا لـە برسـیٚتیدا نـەمرن زمـانی پیٚکـردەوە گـوتی، نـەبونی ونـەداریی ئـەم کارانەت پیٚ ئاسان دەکات.
بڕیٚ پارەی باشـی لـە گیرفـان دەرهیٚنـا وپیٚیـدا وگـوتی دەمـەویٚ ئـەم پارەیە بـۆ خیٚزانەکـەت هەواڵـە بکـەیت.پارەکـەی لیٚـوەرگرت وگـوتی

فەرموون با بچین بۆ نەشتەرگەریی بێئەوەی مامەڵە بکەم، بەم پارەیە ڕازییم.
بڵند وتی چاوی تۆم ناوێ، ناتوانم چاوی تۆ لە جێی چاوم دابنێم.
عەبدولڕەحیم :منیش ناتوانم ئەم پارەیەت لێوەربگرم.
– ئەو پارەیە بۆ تۆ نییە، بۆ دوازدە کەسی خێزانەکەتە.
– تۆ زۆر مرۆڤ دۆستی، لەبەر ئەوە دەمەوێ ئەمجارەیان مرۆڤانە چاوم پێت ببەخشم.
– هەموو بینینێکم بە چاوی تۆ، ویژدانم ئازار دەدات وبە تاوانبارترین مرۆڤ دەمهێنێتە پێشچاو.
چالاك :ئەی چیی بکەین بۆ پەیداکردنی چاوێك؟
– دەمەوێ چاوێکم دەست بکەوێ، ئازاری ویژدانم نەدات، چاوی یەکێکم ناوێت لەبەر هەژاریی بیفرۆشێت، سەرەتا وامدەزانی زۆر ئاسانە کڕینی چاوێك، بەڵام زۆر ئەستەمە ڕازی بم.
چالاك : هیوادارم چاوێك دەستکەوێت، بە دڵی خۆت.
ئەفغانیەکە وتی من پارەکەم لێوەرگرتی بۆ منداڵەکانم، ئیدی بۆ ڕازی نابی یا ناتەوێ چاوی ئەفغانییەك بەکاربێنی، هێند هاوڕێتی کوردم کردووە گەر لەبەر شێوەکەم نەبێت، کاتێ قسە دەکەم کێ دەزانێ من کورد نیم.
بڵند :دەمەوێ هەر ئێستە بچی ئەو پارەیە بۆ خێزانت بنێری ودڵنیام بکەیت لە گەیشتنی.

- تۆ خێرێ زۆر گەورەت کردووە، خوا مەگەر پاداشتت بداتەوە، دەستی نزای بەرز کردەوە لە ناخی دڵییەوە بۆی پاڕایەوە لە خوا.
- چالاك بیگەیەنە شوێنی هەواڵەی پارە بۆ ئەفغانستان، تا زوو بگاتە دەستی خێزانەکەی.

( ٩ )

## کۆمەڵەی نابینایان

پاش ڕۆیشتنی چالاك وهاوڕێکەی، ڕاز گوتی دەفەرموو با بچین بۆ نەشتەرگەریی خۆم وخۆت، دڵنیابووم ناتوانی بە پارە ئەندامی کەسیٚ بکڕیت، گەر من نەیبەخشم کە هاوبەشی ژیانتم، ئەی کیٚ پێتببەخشیٚ؟بەلاٚم بڵند ڕازی نەبوو بە توندی گوتی، چاوی تۆ بۆ من نابێت.

ڕاز : دەچینە لای دکتۆریٚ دی، خۆ هەر ئەو دکتۆرە لە تاران نییە.

بڵند :دڵنیابە وازم لە بیرۆکەی ڕواندنی چاو هێنا، چەند ڕۆژێکی دیکە لێرە دەمێنینەوەو پاشان دەڕۆینەوە.

وەلاٚمی نەدایەوە، دیسانەوە ترسا جێی بێڵیٚ وبۆ لای دکتۆرێکی دیکەی چاو بچێت، چەند جاریٚ بانگی کرد، کە گوێی لە ئاه هەڵکێشانێکی قوڵی ڕاز بوو، ئەوسا بێدەنگبوو، بەلاٚم ئەوەی زۆر سەرنجی هەردووکیانی ڕاکێشا، لێدانی زەنگی تێلێفۆن بوو لە لایەن بەڕێوەبەری نابینایانەوە بۆیان کرا، داوای لێکرا بە زووترین کات بگەنە کۆمەڵە.

لە پرسگە پرسیاری بەڕێوەبەریان کرد، یەکسەر وتی لە چاوەڕوانی ئێوەیە.گرنگی کارەکەیان بۆ دەرکەوت، هەرکە

گەیشتنە ژوورەکەی، وتی مژدەم دەویٚ، لە کاتی خۆیدا گەیشتن، باوەشی لیٚدا و گوتی تا ئیٚستە چاوت دەست نەکەوتووە؟

– ئەوەی من مەبەستمە، نەخیٚر نەبووە.

بەڕیٚوەبەر فەرمووی دانیشتنی لیٚکردن.

ڕاز : سوپاست دەکەین، ئیٚمەت لە بیرە.

بەڕیٚوەبەر :سوپاسی ناویٚ.لاویٚ نەخۆش، نەخۆشی شیٚرپەنجەیە، دەزانیٚ دەرناچیٚ لەم نەخۆشییەی هەر بۆیە دکتۆرەکەی ڕاسپاردووە، پیٚش مردنی ئەندامەکانی لەشی ببەخشیٚ، زۆریش سەیرە ماوەی دووساڵ دەبیٚت، ئەمە دووەمجارە کاریٚکی وا لە لایەن نەخۆشیٚکی بیٚ هیواوە بگوتریٚ.

ڕاز : ئەوە نزا وپاڕانەوەی ئەفغانییەکەیە.

بەڕیٚوەبەر : کام ئەفغانی؟

ڕاز :ئەفغانییەك هات تا بە پارە چاویٚك ببەخشیٚ، بەڵام بڵند ڕازی نەبوو، وتی لەبەر هەژاریی نەبیٚ چاوی نابەخشیٚ، ویٚڕای ئەوە هیٚندیٚ پارەی پیٚدا تا هەواڵەی بکات بۆ خیٚزانەکەی.

بەڕیٚوەبەر :دەکەواتە ئەو کارە چاکەیە وخوا یەکسەر پاداشتی دایەوە، زۆر نییە نەخۆشخانەی گشتی پیٚوەندیی پیٚوەکردین، گوتیان گەر یەکیٚ چاوی پیٚویستە ئەوا نەخۆشیٚکی لاوی کورد خەڵکی شاری سنەیە، هاوشیٚوەی ئەو نەخۆشە لاوەی دوو ساڵیٚ لەمەوبەر کە فارس بوو وخەڵکی تاران بوو، لەبەر بیٚهیوایی لە چاکبوونەوە، بە دکتۆرەکەی ڕاگەیاند پیٚشئەوەی گیان بسپیٚریٚ

ئەندامەکانی لەشی بەو کەسانە ببەخشیٚ زۆر پێویستیانە.بۆ بەخشینی چاو پێوەندیی بە ئێمەوە دەکرێت وەك کۆمەڵەی نابینایان، بۆ ئەندامەکانی دیکەش پێوەندی بە لایەنی دیکە دەکرێت، منیش هەر پاش پێوەندییکردن ئێوەم هاتەوە یاد.
بڵند :زۆر سوپاس بۆ یادنەچوونمان، ئیدی نازانم چۆن بیان ناسین وچیی بکەین؟
بەڕێوەبەر : هەر ئێستە بۆ لای دکتۆر شەهرام دەچین.
***کلینیکی دکتۆر شەهرام***..............................
چوونە ژووری تایبەتی دکتۆر شەهرام، ئەویش گوتی بە ڕاستی کاتێکی زۆر شیاو هاتن، گەر نەهاتنایە خۆم بە نیاز بووم هەلێك برەخسێنم وپێوەندیت پێوە بکەم، چونکە هەواڵێکی خۆشم پێبوو. زانی هەمان هەواڵەکەی کۆمەڵەی نابینایە، بەلاّم زۆر بە پەرۆشەوە گوتی ئەو هەواڵە خۆشە چییە؟
دکتۆر : دکتۆر ئومێد لە نەخۆشخانەی گشتییەوە پێوەندیی پێوە کردووم، نەخۆشێکی لاوی کوردی سنە، ڕایسپاردووە پێش مردنی مسۆگەری(نەخۆشی شێرپەنجە) ئەندامەکانی لەشی ببەخشیٚ بۆ ئەو کەسەی بە هۆی ناساغی ئەندامێکی لەشیەوە، تاڵی ئازار و ناخۆشی ژیان دەچێژیٚ.
بڵند : بە ڕاستی کوڕێکی مرۆڤ دۆستە.
بەڕێوەبەر : دکتۆر، ئەو هەواڵەیان بە ئێمەش ڕاگەیاند، با بە هەردوولامان نەهێڵین لە دەستمان بچێت.

دکتۆر :هەر ئێستە پێوەندیی بە دکتۆر ئومێدەوە دەکەم تا گفت بە کەسی دیکە نەدات وبۆ کاکە بڵند بێت.
بە زوویی تێلێفۆنی بۆ کرد، بە فارسی پێکەوە قسەیانکرد، بڵند وڕاز زۆر باش تێنەگەیشتن، بۆیە لە پێوەندییەکە بووەوە ڕاز وتی دکتۆر چیی بوو؟
– پێمگوت نەخۆشێکم هەیە پێویستی بە چاوی ڕاستە.دکتۆر ئومێد گوتی بۆ سبەینێ ئامادەی بکە، چونکە نەخۆشەکە زۆر پەرێشانە وبیستوچوار کاتژمێری دیکە دەژی، پێویستە پێش مردنەکەی نەشتەرگەریی ئەنجامبدەین. (براکەی پێیگوتووم دەمەوێ تەنیا خۆم ڕاسپاردەکەی برام بزانم، کەسەکانی دیکە نەیزانن نەوەکو ڕازی نەبن) پێش مردنی دەتوانی بیبەی بۆ نەشتەرگەری و وەك ئەوەی دوا هەوڵدانی بۆ دەکەیت بۆ چاك بوونەوەی.ئێستا ئێوە بچن خۆتان بە دکتۆر ئومێد وبرای نەخۆشەکە بناسێنن، پاشان منیش دێم.
لە نەخۆشخانەی گشتی چوونە ژووری دکتۆر ئومێد، زۆر خێرهاتنی لێکردن، تێلێفۆنی کرد تا برای نەخۆشەکە بێت، هەرکە هاتە ژوورەوە، دکتۆر گوتی بۆ کارێکی زۆر مرۆڤانە بانگم کردووی.
– دەزانم بۆ ئەم برادەرانەیە وڕاسپاردەی براکەمە، هەناسەیێ ساردی نائومێدی هەڵکێشا، نیگەرانی بەخشییە ئامادەبوان، پاشان گوتی برای منە ونەخۆشی تۆیە ودەزانی چەندێ کاتی

ماوه لە ژیان، خۆمیش هەستدەکەم زۆری نەمابێ..زیاتر قسەی ئاسایی بۆ نەکرا. . . . بە دەنگێکی لەرزۆکەوە... چەند دڵۆپێ فرمێسکی هاتە خوارەوە . وتی زۆر ماندووە.ئێستێك بێدەنگبوو، چاوەکانی سڕییەوە.پاشان گوتی ببوورن، بەلام برا زۆر خۆشەویستە، بە دکتۆری گوت هەرکات هاتی بڵێ دەیبەم بۆ نەشتەرگەریی ودوا هیوایە ودەبێ واژۆی بکەن لەسەر سەرنەکەوتنی نەشتەرگەرییەکە. ئیدی دوای ئەوە خۆت ڕاسپاردەکەی جێبەجێبکە، بەلام حەزم دەکرد لە بارەی ئەم برادەرانەوە شتێك بزانم.

بڵند: زۆرم پێناخۆشە بۆ براکەت، من ئامادەم گەر لەبەر پارەیەو ناتوانن نەشتەرگەری بۆ بکەن لە دەرەوەی ولات، ئەو ئەرکە دەکەمە سەرشانی خۆم ودوا پولتان لەسەر من بۆ چاکبوونی.

– زۆر سوپاس، دکتۆر ئێمە دەناسێت ولە سنە دەوڵەمەندترین کەس وناودارترینین، بەلام هیچ لەگەڵ ئەم نەخۆشییە کوشندەیە ناکرێ.

– بڕیاری براکەتان ناوداریتان دەسەلمێنێ.من ناوم بڵندە، خەڵکی شاری هەڵەبجەم وبە کارەساتی کیمیابارانی شارەکەم چاوەکانم لە دەستداوە، چاوێکی ڕاستم پێوستە.

– منیش ناوم ئازاد، وبراکەم ناوی ئارام، ئێستە دڵم بە ڕاسپاردەی براکەم زۆر خۆشەو شانازی پێوە دەکەم بە تایبەت کوردێکی هەڵەبجەیی سوود لە ئەندامی لەشی براکەم وەردەگرێ.لەو کاتە

دکتۆر شەهرام و چالاك هاتن، دکتۆر ئومێد گوتی لە کاتی خۆیدا هاتن.چالاك وتی کاك بڵند پێوەندیم بە دکتۆر شەهرامەوە کرد، ئەو پێیڕاگەیاندم وتی وا دەچم بۆ نەخۆشخانەکە، وتم جێم مەهێڵە، بە ڕاستی خۆشترین هەواڵ بوو.

– سوپاس بۆ تۆ و بۆ هەموو لایەك.دکتۆر شەهرام لەگەڵ دکتۆر ئومێد بە زمانی ئینگلیزی کەوتنە قسان، زۆر باش تێگەیشت، دکتۆر ئومێد وتی سبەی بەیانی زوو ئامادە بە بۆ نەشتەرگەریی هەردووکیان، چونکە سبەینێ بە دڵنیاییەوە ژیانی کۆتایی پێدێ.

ئازاد دکتۆر بۆ لای ئارام ئەڕۆم، بە دەنگێکی نەوی، پڕ سۆز وبەزەیی وتی هەر کات ویستت، ئامادەین.

دکتۆر:سبەینێ دێم وپێتەڵێم.داوای لێبوردنەکەم بمانبەخشە.

بڵند بانگی ئازادی کرد، گوتی براکەم گەر تۆزقاڵێ دڵت ئازارتدەدا بەو بەخشینە، نامەوێ، با ئازار نەچێژی.

ئازاد :ڕاسپاردەی براکەمە، حەزدەکەم کەسی دیکەش بێت تا سوود لە ئەندامی براکەم وەرگرێ، خۆی بۆ نەگیرا بۆ ئەم قسەی دوایی هەناسەی تەنگبوو، ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی بڕوا بکە حەزدەکەم، زۆریش حەز دەکەم، تا بە ئارامی ڕاکشێ ومنیش بە جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکەی پاش ئەو ویژدانم ئارام بێت، ئەم بڕیارەی هەفتەیەکەداوە، چونکە هیچ هیوای نەما بە ژیان و دوو ساڵە بە ئازارەوە دەتلێتەوە، زۆر ئازاری چەژتووە هەر بۆیە دەیگوت(ئازار زۆر ناخۆشە، تەندروستی باشترین کەنزی دونیایە

گەر خوا پێت ببەخشێ، بۆیە دەمەوێ مرۆڤێکی خۆپەرست نەبم وهەر کەسێك پێویستی بە ئەندامێ لە ئەندامە ساغەکانم هەیە بە گەردن ئازاییەوە پیرۆزی بێت، دەیگوت ئازاد گیان گەر وا بکەم وەك ئەوەیە نەمردبم وبووبێتمە چەند کەسێك لە ژیان، هەربۆیە تکات لێدەکەم چ ئەندامێکم بەکاردێت با دکتۆرەکان بۆ نەخۆشە بێهیواکان بەکاری بێنن، ڕزگاریان بێت لە ئازار، لە بێئومێدی).
یەك شتێکم لە جەنابتان دەوێت، دەمەوێ بتبینم، تۆ هەڵگری چاوی براکەم دەبیت، بە بینینت دڵفەرامۆش دەبم.
حەزی نەکرد بگری ، بەڵام خۆی بۆ نەگیرا وباوەشی بە بڵندا کرد.

( ١٠ )

## نەشتەرگەریی

تەنیا ئەوەندە ئاگادار بوو، لە سەر قەرەوێڵەیەك ڕایانکشاند و دەمامکیان خستە سەر دەمی، پاشان لە دەنگی ڕاز وچالاك بە ئاگا هات، زۆر بانگیان دەکرد، جاروبار دەیویست قسە بکات، بەڵام هەستی بە گرانی زمانی دەکرد ونەیدەتوانی یەك وشە دەربڕێ، لە نزیك بەنج بەردانا بوو، لە پڕ زمانی بووەوە، (ئارام گیان بمبوورە، ئازاد ئێوە دیارە بنەماڵەیەکی ناودارن بۆ مرۆڤدۆستی) یەکەم دەربڕینی قسەکانی بوو، جۆرین قسەی دەکرد، (ڕاز بە هۆی ئەم چاوەوە دەتبینم، ئەمجارە هەر دڵودەست ناتبینێ، ئەمجار بە چاو دەتبینم) دڵی تێکچوو، ڕشایەوە، چالاك نێوچەوانی گرتبوو، ڕاز بە کلێنس دەمی پاکدەکردەوە.دەستی بۆ چاوی دەبرد، ڕاز گوتی بڵند گیان، چاوت بە لەفاف پێچراوە، تا یەك هەفتە دکتۆر شەهرام نایکاتەوە.تۆزێ هاتەوە هۆشی خۆی وتی نەشتەرگەرییەکەم تەواوبوو؟

چالاك : کاتژمێرێکە تەواو بوویتە.

– ئەی ئارام چیی لێهات؟

چالاك:دکتۆر شەهرام وتی، پاش دوو نەشتەرگەری، (چاو بۆ تۆ، گورچیلەش بۆ یەکێکی دیکە)، بە یەك کاتژمێر گیانی پاکی سپارد وئازاد وکەسەکانی تەرمی پیرۆزیان بۆ شاری سنە بردەوە.
ڕاز :ئینشەلاّ، خوا پاداشتێکی زۆری دەداتەوە، چونکە ئەوی دیکە کەسێکی زۆر نەداربوو، کرێکاربوو، منداڵە وردەکانی لە باوکیان کۆببونەوە، تا بۆ دواجار باوکیان بیانبینیٚ.(ئازاد زۆر دەگەڕا تا نەخۆشی دیکەی بێهیوا ببینێتەوە لەسەر ڕاسپاردەی براکەی، کە پێیانگوت وزانی، بەپەلە چوو، ئەو دیمەنەی بینی یەکسەر پێوەندیی بە دکتۆر ئومێدەوە کرد وگوتی بۆ سبەینیٚ نەخۆشێکی دیکەم دۆزیوەتەوە).
بڵند: دەترسم بە هۆی نەشتەرگەرییەکانەوە گیانی سپاردبیٚ؟!
چالاك :نەخێر، پێشئەوەی بیبەنە هۆڵی نەشتەرگەرییەوە، بە تەواوی بێهۆشبوو، پاش پشکنینێکی ورد، ئەوسا دکتۆر ئومێد بە ئازادی برای گوت، بەلای زۆرەوە دوازدە کاتژمێری ماوە لە ژیان. ئەوسا دکتۆر شەهرام نەشتەرگەرییەکەی تۆی ئەنجامدا.
بڵند وڕاز گوتیان خوا بە بەهەشتی شاد بکات.
چالاك وتی ڕاز خان دەزانێت، هەوڵمدا خۆم بڕیٚ پارەیان پێبدەم بۆ خەرجیی ڕێگە وپرسەکەی، بەلاّم ئازاد گوتی ئێمە خاوەنی چەندین کارگەین وپێویستمان بە پارە نییە، جێبەجێکردنی ڕاسپاردەی براکەم هەموو کەنزی دونیایە بۆمن، بەلاّم دەمەویٚ پاش سەرکەوتنی نەشتەرگەرییەکە کاك بڵند سەردانیمان بکات

وتا لـه نزیكـەوه چاوی براكـەم ببینـم، وەك بینینـەوەی براكەمـه بـه زیندوویی، تا شانازی به براكەمەوه بكەم، چەند دڵ گـەوره و مـەرد و مـرۆڤ دۆسـتبوو. ئیـدی ئـەوه هـەموو سـەروەتی دونیـای منـه.كـارتێكی پێـدام گـوتی گـەر هاتنـه سـنه بـەم ناونیشـانه دەمدۆزیتـەوه، كارتەكـەی ڕاسـتی قسـەكانی بـۆ سـەلماندم، چـونكه ناونیشانی كارگەكەیانه.

ئەو هەفتەیەی لێببـوو به حـەوت سـاڵ، نـەك هـەرلای ئـەو، لای ڕاز ودایكی ومامی وكاوه وچالاك، چونكه هەمیشـه پێوەنـدییان پێـوه دەكردن، ئاخۆ كەی ئەنجامی نەشتەرگەرییەكه دەردەكـەوێ، بیر و هۆشـی ئاڵۆزانـدبوو، ڕۆژانـه دكتـۆر شـەهرام سـەردانی دەكـرد وباشترین دڵخۆشكەربوو بۆی، ورەی بەرزدەكردەوه، بەڵام كـه دوور دەكەوتەوه باری دەروونـی ئـاڵۆزدەبووەوه، ئیدی ڕاز دەكەوتـه وره بەرزكردنەوەی ودەیوت چەندین ساڵه چاوەڕوانیی ڕۆژێكی وای تـا دكتۆر نەشتەرگەرییەكت بۆ بكات و هیوایەكت پێببەخشێ، كەچـی تـۆ لـەبری دڵخۆشـیت هەمیشـه بێـدەنگ، لـه نێـو خـەیاڵا چـەقیوی. پێكەنینێكی بۆ ڕاز كرد تا دڵخۆشی بكات وگوتی ڕاز گیان ڕاستە، دەكەومه نێو خەیاڵی كردنەوەی چاوەكانم، (بینینی ئەو دوو چاوه جوانانەی تۆ).

شەوی حەوتەمـه و بـەیانی كـاتی كردنـەوەی لەفافەكه بـوو، خـەوی لـێ نەدەكـەوت، (جاروبـار لەفافەكـه دەكرایـەوه، چـاوی كەسـی

نەدەبینی وتاریکی دایپۆشیبوو، هێندێ جار یەکەم کەس لەگەڵ کردنەوەی لەفافەکە بینینی چاوە جوانەکانی ڕاز بوو).
بەیانی لە چاوەڕوانی دکتۆر شەهرام بوون، ئەفغانییەکە لەگەڵ چالاك هاتبوو، هەر نزای دەکرد، لە خوا دەپاڕایەوە نەشتەرگەرییەکە سەرکەوتووبێت.بڵند زۆر پەلەی بوو، جاروبار پرسیاری کاتژمێری لە ڕاز وچالاك دەکرد، تا لە پڕ چالاك گوتی ئەوا دکتۆر هات.
دکتۆر :کاکە بڵند، هەر ئێستە لەفافەکە دەکەمەوە وئینشەڵا بە چاوێکی زۆر جوانەوە دەمانبینی، یەکیان ساغ وئەوی دیکە شوشەیەکە کە کەس هەستی پێنەکات شوشەیە وەك ئەوەی بەڵێنمپێدای.
بڵند لە چاوەڕوانی بوو، دکتۆر هەستی بە لێدانی دڵی دەکرد، دەستی خستە سەر سەری یەکەم پێچی لەفافەکەی کردەوە، تا پێنج جار پێچی کردەوە گوتی دوا پێچە، کە کردمەوە یەکسەر چاوەکەت هەڵمەهێنە، چاوەڕوان بە، تا خۆم پێت دەڵێم.
– زۆر باشە دکتۆر.
دکتۆر :بۆ وا هەناسەت تەنگبووە، لە چیی دەترسی.مەترسە وپەنا بە خوا، ناوی خوای هێناو ئەو پێچەشی کردەوە گوتی تا پێت نەڵێم چاوت مەکەرەوە.پاش کەمێ پشکنین وپاککردنی پێڵووی چاو، گوتی بیکەرەوە.

به دڵەکوتێ و ترسەوە، کەمێ پێڵووی چاویکردەوە، کە پێڵوەکەی تەواوکردەوە.
دکتۆر گوتی پێش چاوت ڕووناکە؟
– بەڵێ.
– ئێستە سەرت کەمێ بەرزبکەوە، بزانە کێ بەرانبەرتە، کپ وبێدەنگ، هەستیان لێڕاگرتبوو.تارماییەکی بەرانبەری بەدیکرد.
دکتۆر :مەترسەو چاوت تەواو بکەوەرەوە.
ڕاز بوو، بە سەرسوڕماوییەوە تەماشای دەکرد، زمانی لاڵ ببوو، نەیدەتوانی بڵێ چاوە جوانەکانی ڕاز دەبینم، چاوە جوانەکانی هەر وەك خۆی بوون وکیمیاوییەکە کاری لێنەکردبوو، بالآی بەرزتر وڕوومەتە ئاڵوبێگەردەکەی وەك خۆی مابوو، دەترسا هەر ئەو کەمە بینینە بێت ولە پڕ تاریکی چاوی داپۆشێ، (وەك ڕووناکییەکەی لای بەردی پیرۆز)، هەر بۆیە چاوی لە بینینی چاوە جوانەکانی بڕیبوو، ئاگاداری کەسی دیکە نەبوو.
لە پڕ دکتۆر شەهرام گوتی بۆ وا حەپەساوی، هەموو چاوەڕێی تۆمانە!!.
بە ئاگا هاتەوە، زمانی کرایەوە و گوتی ئەوە (ڕاز)ە.
ڕاز بە پڕتاو وتی توخوا دەمبینی. دەمبینی. گریا، فرمێسکی هاتە خوارەوە، ویستی باوەشی پێدا بکات، بەلآم دکتۆر نەیهێشت گوتی پەلە مەکە با بزانم بینینی چۆنە، دکتۆ وتی تەماشای ئەو دوو هاوڕێیەت بکە وبزانم دەیانبینی.

ئەفغانییەکە دەستی نزای بەرزکردبۆوە ولە خوا دەپاڕایەوە.
چالاك : بڵند گیان دەمبینی؟!
- چالاك گیان دەتبینم، عەبدولڕەحیمیش دەبینم.
دکتۆر :ئێستە تەماشای من بکە.
- دکتۆر تۆ فریشتەی، قوربانی دەستت بم، بە دەنگیٚ لەرزۆکەوە، بەردەوامبوو لە پیاهەڵدانی دکتۆر، حەڤدە ساڵە لای دکتۆری هەرە پێشکەوتوو پشکنینم بۆ دەکریٚ کەچی هەموو کات بێئومێد دەبووم، کەچی لە دەستی تۆدا ئومێدم پێبەخشرا، خوای گەورە نەك هەر ئەم دونیا، بەهەشتیشت هەمیشە بۆ بکاتە چراخان.دکتۆر ئەم پیاهەڵدانەی پێخۆشبوو بە تایبەت کە باسی باشترین دکتۆرەکانی جیهانی بۆ دەکرد، بە ڕوویەکی خۆشتر، هەست بە سەرکەوتنێکی بێهاوتاتر، پەنجەکانی دەستی لێنزیککردەوە گوتی چەند پەنجەیە؟
-پێنج.
پاشان دوو پەنجەی نوشتانەوە، ئەی ئێستە؟
سیٚ.
- پیرۆزباییت لێدەکەم تا ئێستە باشترین چاو پاش نەشتەرگەریی کرابنەوە، ئەمەی تۆیە.جوانترین دانانی شوشەی چاویش کە زۆر لەگەڵ ئەم چاوە گونجابێت، ئەمەی تۆیە.فەرموو هەستە.
هەستایە سەرپیٚ، باوەشی بە دکتۆر شەهرامدا کرد، چەند ماچێکی دکتۆری کرد، ئەویش ماچی کرد وگوتی تا یەك هەفتەی

دیکه بمێنەوە لە ئوتێل لە تاران ودوو ڕۆژجارێ وەرن بۆ لام، تا بڕیاری چوونەوەتان بدەم.
سەری بەرزکردەوە گوتی (خوایە گیان، ئارام ئێستە لە بارەگاکەی خۆتە، دونیای بۆ ڕووناککردوومەتەوە، دەبێت ئێستە لە نێو باخەکانی بەهەشتت بسوڕێتەوە، چونکە کارێکی مرۆڤانەی لەگەڵ کردووم و خۆتیش دەفەرمووی دەبێ لەگەڵ یەکدیا وابن).
هەموو گوتیان ئامین.
ڕاز : گۆچانەکەت بۆ بێنم، یا قۆڵ بخەمە نێو قۆڵتەوە؟
- گۆچانم ناوێ وهەزار نەعلەت لەو کەسەی گۆچانی پێهەڵگرتم، هەزار ڕەحمەت لەوەی گۆچانی حەڤدە ساڵەی پێفڕێدام، بەڵام باش گوێ بگرە ڕازە گیان، لە قۆڵ خستنە قۆڵمەوە خۆشنابم.
هەموو پێکەنین ودکتۆر گوتی من دەڕۆم، دووبارە پیرۆزباییت لێدەکەم، هیوادارم تۆ وئەم هاوسەرە بەوەفایە هەرلە خۆشیدابن.
- دکتۆر گیان پاداشتی تۆش مەگەر هەرخوا بتداتەوە، دووبارە خوا هەر ئاگادارت بێت بۆ فریاکەوتنی نابینایان.
ئەو ڕۆیشت وئەفغانییەکە گوتی یا خوا هەر خۆشبی، لەو ڕۆژەوە ئەندامانی خێزانەکەم هەر نزای چاکبوونەوەیان بۆکردووی، بەو پارەیەت خۆشی وشادیت خستە نێو دڵی خێزانەکەمەوە.
- ئێمە براین وپێویستە گیانی هاوکارییمان تێدا بێت، دیاریەکت لای چالاك بۆجێدێڵم سبەی لێیوەرگرە.
- سوپاس، چاکبونی تۆ هەموو دیارییەکی منە.

چالاك : ئێستا چیی بکەین؟

بڵند : پێوەندیی بە کەسەکانەوە دەکەین وپاشان دەچینە نێو بازاڕ چەپکە گوڵ بۆ کلینیکی دکتۆر شەهرام ودکتۆر ئومێد وکۆمەڵەی نابینایان و تاجە گوڵینەیەکی نایاب بۆ سەر مەزاری پیرۆزی ئارام وجوانترین دیاری بۆ تۆ پاشان دیاری بۆ ڕاز ودایکم و مامەم وکاوە) دەکڕین.گەر بە ئەرك نەبێت هەر ئێستە دەمەوێ بچیت شیرینی بێنی وبەسەر کارمەندانی ئەم نەخۆشخانە پیرۆزەدا دابەشی بکەین.ئەوسا مالآواییان لێبکەین.

ئەو ڕۆژە وەك نەدیوبدی تەماشای هەموو شتێکی نێو بازێڕی دەکرد.

( ١١ )

## ئوتێل

لـه ئـوتێلێکی دیکـه، لـه پلـه نایابـەکانی ئـوتێلی تـاران ، چـوونه ژووری ژماره پێنجسەد ودوو، له نهۆمی پێنجەم، بۆ یەکەم جاری بۆ لای پەنجەرەکه چوو وبه دەستی خۆی کردییەوه تا دەرەوه ببینێ، گریان گرتبووی بۆ ئەو تەمەنەی به نابینایی بردبوویه سەر.

له پڕ ڕاز خۆی گەیاندێ، تێگەیشت دڵی پڕبووه، بۆیه زۆر به زوویی گوتی نەکەی فرمێسك به چاوانتا بێته خوارێ، یەکێك له ڕێنماییەکانی دکتۆر شەهرام بۆ ئەم هەفتەیەی مانەوەمان له تاران فرمێسك نەڕشتنه.

پەردەکەی داخست و گرتی به دەستیا و وتی چەند ڕۆژه خۆمان نەشۆریووه، با بچینه گەرماوەکه چونکه به ڕاستی گەرماوێ نایابه, نامەوێ لەمەولا بیر له شتی ناخۆش بکەیتەوه، چونکه ئەویش یەکێکه له ڕێنماییەکان.

- ڕاسته من چاوەڕوانی ڕۆژێکی وەك ئەوڕۆ بووم به چاوانم تێر بینینی ئەو چاوه جوانانه ببم، بەلأم (ناخی مرۆۋ وایه، خۆشی له یاد ئەکات، بەلأم ناخۆشی ودەردو مەینەتییەکانی ژیان به ئاسانی

له یاد ناکات).زەردەخەنەیەکی بێوێنەی بۆ کرد وتی من ڕازم، ئەو ڕازەی زۆر لە مێژە چاوەڕوانی بینینی بووی، ئەو شەو دەمەویٚ سەراپای بالاّوجوانی خۆمت پێشکەشکەم وخەمومەینەتییەکانی چەندین ساڵەت بە بادەم.

پاش گەرماو خۆی بۆن پرژێن کرد وچووە سەر قەرەوێڵەکە ولە چاوەڕوانی ڕاز دا بوو، کەژاوەی هاوسەرێتی ئەو شەوە بێوێنە بوو، چ کەژاوەییٚ، بە جوانییەکی بێئەندازە جوان، ڕۆبە پەمەییەکەی کردەوە، بووکە شوشەیەك خۆی لە نێویدا حەشاردابوو، لەو ڕۆژەوەی پێکەوە دەنوستن، تەنیا دەستەکانی تامەزرۆییان شکابوو (چۆن خواردن لە دەمەوە خۆی دەگەیەنێتە گەدەو ڕیخۆڵەکان ومرۆۋ پێدەژی)بەلاّم لە چاوەوە موچڕکی ئیشقوخۆشەویستی دەگەیشتە، گیان، مێشك دڵ، شادەمارەکان، نەست.

بینینی بالاّ و بە ڕووتی، دوو مەمی خنجیلە، وەك تازە پێگەیوو بێت وابوو، توندوتۆڵ، هێند توندوتۆڵ لە ژێر دەستیدا ڕایدەکرد، ئاوی لە تاکە چاوەکەیەوە دەردەهێنا، موچڕك، چ موچڕکێك!! دەبووە هەوری بەهارو چ کانیاوێکی چەندین ساڵ هەبوو لە نێو لەشیدا هەڵدەقولاّ، وایاندەزانی خەونە، ئەو خەونەی هەمیشە دەبووە میوانی شەوانیان، بەلاّم خەو نەبوو، چاوی قاوەیی زۆر کاڵ، بە برژانگی درێژ و جووت برۆی نەخشێنرابوو، گەردنی سپی، لێو وکوڵمی ئاڵ، قژی خاوی باینجانی، ڕووی سپیوسۆڵی

جوانتر پێشاندەدا، بەسەر دوو لیمۆیدا هاتبوونە خوارێ، چاوە تاقانەکەی پڕ ئاو کرد بوو، پیتەکان لە زمانێکی پاراو، بە نێو دوو لێوی ناسك دەهاتنەدەر و وشەیەکی ناسکیان پێشکەش دەکرد (بڵند گیانەکەم) و زەردەخەنە یش وشەکانی بۆ ناسکتر دەکرد، ئاوازێکی مۆسیقی دەئاخنییە گوێ وخۆشییەکی هەرگیز نەدیوی پێدەبەخشی، سەراپای ئەو بەژن و باڵایەی لێ شیرینتر دەکرد.تێر تەماشا نەدەبوو.ڕاز پێیگوت با ئیدی بنووین، چونکە خاڵێکی دیکە لە ڕێنماییەکانی دکتۆر، زۆر نووستن وکەم تەماشاکردنە تا چاوت ئازاری نەبێ.

– هەموو ڕێنماییەکان دەخەمە سەر چاوم، بەڵام ئەمەیان نا، چونکە زۆربەی هەوڵدان بۆ چاکبوونی چاوەکانم، بینینی سەراپای تۆیە، چاوە جوانەکانی تۆیە، نەهێشتنم بە بەخشینی چاوت، هەر لەبەر ئەو هۆیەیە، جگە لەوەش دەترسم بەیانی هەستم وچاوەکان لە بینین کەوتبن.

– تا مردن هەر پێکەوەین، دڵنیابە چاوت لە کار کەوتنی نییە، بەڵام دەبێت ڕێنمایی جێبجێبکەین، هەر بۆیە گەر خۆشت دەوێم، چاوەکانت بنووقێنە وبنوو.

یەکەمجاری بوو (پاش کیمیابارانەکە) هەستێ لە خەو و وچوار دەوری خۆی ببینێ، بینینی یەکەم کەسیش ڕاز بێت.تازە لە گەرماو تەواو ببوو و بەرەو لای دەچوو، (بەیانی باشی) بە نێو دوو لێوی ناسکی، کەناری ئاسای ئەو بەیانییەی بڵند بوو، قژی

بەلایەکیدا خستبوو، بریسکەی ڕوومەت وکوڵمی ئاڵی دڵی ڕاچڵەکاند.

- بۆ هێند جوانی، تۆ پەری باخی بەهەشتی.

چاوە گەشەکانی هەڵبڕی، بە خەندەیەکی جوانی ڕووی پاك وبێگەردی وەلآمیدایەوە، (ئەم ڕۆژەم دەویست بە تامەزرۆوە بمڕوانی، تا ختوکەی خۆشەویستیی سەراپای جەستەم بگرێتەوە)

- دەتویست هەر وا بە ئاسانی لە بینینی ئەو چاوانەتم بکەیت و خۆت بە زۆر بخەیتە ژێر نەشتەرگەرییەوە؟!

- هەموو کات ئامادەم گیانم لە پێناوتا ببەخشم.

-سوپاس هاوسەری بەوەفا، دەفەرموو بە پەلە خۆت ئامادە بکە.

هەر دووکیان ئەو هەفتەیە خۆشترین کاتیان بوو لە ژیانیان، مژدەی دکتۆریش بۆ چوونەوەیان زیاتر دڵخۆشیکردن.دوا شەویان بوو. لەگەڵ چالاك ڕێکەوتن بەیانی زوو لە تارانەوە بەرەو سنە بۆ لای ئازاد ودانانی ئەو تاجە گوڵینەیە لەسەر مەزاری شەهید ئارام. باوەڕی نەدەکرد بێ گۆچان وبێ ڕاز دەڕۆیشت، بەلآم هەموو کات ڕاز وچالاك بە ڕۆیشتنی پێدەکەنین، چونکە وەك جاران بە وریاییەوە دەڕۆیشت وهێشتا ڕانەهاتبوو.

پانوبەرینی شەقامەکان، جۆرین تەلاری بەرز، دیمەنی پارکەکانی بە گوڵی زۆر جوان و ڕەنگاوڕەنگ، بازاڕێکی مۆدێرن و پڕ لە شتومەکی نایاب، سنەی ڕازاندبووەوە، لە هەمووی دڵخۆشکارتر کەلتوور ودابونەریتی کوردەواری تەواوی لە خۆ گرتبوو، بە

لەبەرکردنی جلی کوردی جۆراجۆری لاو وپیر و کچان وژنانی ئەو شارە ڕەنگینە دیمەنێکی دیکە بوو.

بلّند : شارێکی کوردەواریی زۆر دلّگیرە.

چالاك :لە بواری ڕۆشنبیریی زۆر پێشکەوتووە.

بلّند : ئەی لە ڕووی مرۆییەوە!! یەکێکی وەك ئارامی جوانەمەرگی تێدا هەلّکەوتووە.چالاك گیان دەبێت کارگەکە لە کوێوەوە بێت؟

– زۆر شارەزام، زۆرمان نەماوە بگەینە ئەم ناونیشانەی پێیداوم.

زۆری نەخایاند لە پێش کارگەکە وەستا، چوونە ژوورەوە.

چالاك :ئەوە ئازادە وا بەرەو پێشوازیمان دێت.

نزیك بووەوە، باوەشی گرتەوە، ئەویش لە خۆشیاندا دەستی بە گریان کرد وگوتی وا دەزانم ئارامی جوانەمەرگ زیندوو بووەتەوە بۆ لام گەڕاوەتەوە.

– منیش ئارامی براتم.

تێر تەماشایکرد، بە تایبەت تاقەچاوەکەی ئارام زۆر سەرنجی ڕاکێشا وفرمێسکی لە چاوان دەباران، زۆریش پیرۆزبایی لێکرد. ڕووی کردە لای چالاك وڕاز وگوتی داوای لێبووردن دەکەم لە خۆشییان ئاگام لە ئێوە نەما.

پاش کەمێ دانیشتن لە ژوورە تایبەتەکەی خۆی، پاشان بە نێو بازاڕدا چوون ، جوانترین تەلاری پێشاندان وگوتی ئەو تەلارە هی ئارامە، جگە لەمەش باشترین فرۆشگەی لە نێو بازێڕ هەیە، تەنیا مابوو هاوسەرگیریی بکات و خێزان پێکەوە بنێ، بەلاّم نەخۆشی

شێرپەنجەکەی تووش بوو، ئیدی دونیای لە پێش چاوکەوت، وازی لە هەموو شت هێنا.

چوونە مەزاری ئارام تاجەگوڵینەیان لەسەرگڵکۆی دانا، سەری ڕێزیان بۆ گیانی پاکی ئەو مرۆڤدۆستە دانەواند.

بڵند کێلەکەی ماچکرد وگوتی دەزانم ئێستە ڕۆحی پاکت بەسەر سەرمانەوەیە و بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازییمان لێدەکەیت کە توانیت بڕیاری بەخشینی ئەندامەکانی لەشت بدەیت، دونیا بۆ یەکێك وەك منی نابینا ڕووناکبکەیتەوە ومرۆییت لە مێژووی مرۆڤایەتی تۆمار بکەیت.

چەند دڵۆپێ فرمێسك لە تاقە چاوەکەی ئارامەوە، گڵی سەری تەڕکرد، وایکرد ( ڕۆحی ئارام بێگەردتر بکاو دڵخۆشیبکات) .

ئازاد حەزیدەکرد چەند ڕۆژێك بمێننەوە.بەلاّم بڵند گوتی، ئێستە پیرە دایك چاوەڕوانە وخۆتیش دڵی دایك دەزانی بۆ ئەم چاوەڕوانییانە چ جەرگ ودڵێکی پەشێو و بێئارامییان هەیە.

لە بەر دایکت نەبێ نایەڵم بڕۆن، باوەشی لێداو گوتی تەنیا داواکاری من، خۆ بزر نەکردنتە، حەزدەکەم سەردانیم بکەیت وزوو زوو پێوەندییمان پێوە بکەیت، چونکە تۆ لە جێی (ئارام)ی.

بڵند وتی ئێمە براین، براش ناتوانێ خۆی لە برا دوور بخاتەوە.

تا لە سنە دەرچوون بە ماشێنەکەی بە دوویانەوە بوو ومالاّوایی لێکردن.

## (١٢)

## سەرمەرز

پاش بڕینی شار بە شار وشارۆچکە بە شارۆچکە و گوند بە گوندی قەت پاڵی چیاکانی کوردستان، هەستیدەکرد چاوەکانی هێند بەکار هێنابوو ئازاری هەبوو، وێڕای ئەو ئازارە، گریان قوڕگی گرتبوو، نەیدەتوانی ڕێ لە هاتنە خوارەوەی دڵۆپە فرمێسکەکان بگرێت، (شنروێ)، ببووە پێشمەرگە، ببووە قەڵغانی تۆپەکانی دوژمن و هەڵەبجەی دەپاراست، هەستیدەکرد شنروێ باوك و دایکی شارەکەیەتی، ئەویش خۆی پێڕاگیر ناکرێ لە ئاستی زوڵم وزۆرداری دوژمنان، بە دیمەنە دڵتەزێنەکانی شارەکەی دڵۆپ دڵۆپ ئەشك دەڕێژێتە نێو دۆڵ و قەتپاڵ وکۆلاّن بە کۆلاّنی شار. لەسەر مەرز، چالاك گەڕایەوە، کاوە وەریگرتن.لە خۆشیدا نەیدەزانی چیبڵێ، بڵندی دەبینی بە تامەزرۆوە تەماشای هەموو شتێك دەکات، گریانی بۆ دڵخۆشی بڵند دەهات. بینینی ئەمجارە بۆ دیمەنەکانی نیشتمان، شادی، ئارامی دەروونی پێدەبەخشی، خاکی نیشتمان، ئازادی ساوا و تاقانەی لە ئامێز گرتبوو، کراسێکی ڕەگاوڕەنگ لە گوڵوگوڵزاری ئەو بەهارەی لە بەرکرد بوو، هیوای دواڕۆژی گەشاوەی نیشتیمانیی پێدەبەخشی.

ڕووی لە کاوە کرد وگوتی کاوە گیان دەبێ زەردە چۆن بێت ئاخۆ تەندروستی باشتر بووە.سەرەتا حەزی نەدەکرد وەڵامبداتەوە، دووبارەی پرسیارەکە بێدەنگی پێپچڕاند، گوتی حەزم نەدەکرد کاتێ لە تاران بوون پێتی بڵێم، ئەوی ڕاستیبێ چاوەڕوانی تۆین تا بڕیاری دکتۆری ڤێتەرنەری جێبەجێبکەین بە لێدانی دەرزییەك بۆ لە ناوبردنی.

– بە ڕاستە؟!!

ڕاز : دڵخۆت تەنگ مەکە، باش نییە.

کاوە :حەزم نەدەکرد ئەم هەواڵەی پێبڵێم، بەڵام زەردە لە ژوورەکە بەندکراوە و دەرگای لێناکەینەوە و زۆریش دەوەڕێ تەنانەت دراوسێکانی وەڕەس کردووە.هەرلەبەر خۆشەویستی تۆ بۆ زەردە نەمهێشتووە لەناوی ببەن و هەمیشە گوتوومە (ئەمە ڕاسپاردەی بڵندە، چاوم لە سەگەکەی بێت تا دەگەڕێتەوە، جگە لەوەش لەو ڕۆژەوەی بوومە هاوڕێی وهۆگری بووم، منیش زۆرم خۆشدەوێ).

– کەواتە ناتوانم لە ئامێزی بگرمەوە؟!

–کەس ناناسێ، دکتۆری ڤێتەرنەرییەکە ماوەیەك لەمەوبەر پێیگوتین نەخۆشییەکەی هاریە وئەوپەڕی چل ڕۆژێ دەژی.

ڕاز :(زۆر کارەساتی ناخۆش ودڵتەزێنمان بینیووە، توانای ئارامی و خۆگری زۆری پێبەخشیووین، نەخوازەلا، خەمخواردن بۆ ئاژەڵێ!!هەر پێویست بە دڵتەنگی ونائارامی ناکات)، ڕاز ئەمەی دەوت، بەڵام خۆیشی لە ناخەوە بۆ زەردە دەگریا.

بڵند ئاهێکی لە ناخەوە هەڵکێشا و وتی زۆر هاوڕێیەکی دڵسۆز بوو جا با ئاژەڵێکیش بێت، گرینگ بەوەفایی و خۆشەویستییە.
گەیشتنە نێو بازاڕ، چەند تەماشایدەکرد کەسی لێنەدەناسین، بەڵام دوکان بە دوکانی دەناسییەوە وهەموو ئەو کەسانەی کاتی خۆی لەسەری بوون وئێستەش نایانبینێ وپێدەچێ بووبنە قوربانی لە کارەساتەکە، لەبەر دوکانەکانیان دەسیان لەبەر پشتێنیان نابوو تەماشایاندەکردن.
کاوە :کەس دەناسییەوە؟
بە ئاگا هاتەوە وگوتی کەس ناناسم، بەڵام خاوەنی کۆنی ئەم دوکانانە هەر لە پێشچاو وون نابن وهەر وا دەزانم ئەوانن ولە پێشوازی کڕیارەکانیان وەستاون.ڕاز وتی کە زیاتر بیر نەکاتەوە.
– ڕاز گیان ئەو خەمە تێکەڵ خوێنمان بووە وناتوانین وا بە ئاسانی لە یادی بکەین.
گەیشتنە لای ماڵ و گوێی لە وەڕینی زەردە بوو، هێند پەرێشانی کرد، دڵی گریان، چۆکی دەلەرزی، نەیدەزانی چۆن دەست بە سەریا بێنێ وچاو ودڵی ڕوون بکاتەوە.کە چوونە ژوورەوە سەگەکە زیاتر دەوەڕی و بە پەنجەرەکەیا هەڵدەگڕا.لەوکاتە دایکی بە هەڵەداوان هات و هەر لە دوورەوە وتی بڵندەکەم نەکەی دەرگای لێبکەیتەوە، تۆش ناناسێتەوە، پەلامارتدەدا، خۆی گەیاندێ و باوەشی لێدا، لە تاو بینینی دایکی، وازی هێنا، سەرنجی بێئەندازەی لە دایکیدا، بەڵام پیری پێوە دیاربوو، وەك دەنگە پڕ

سۆز و خۆشەویستییەکەی نەبوو، کە وەك خۆی مابوو. دایکی لە خۆشی چاکبوونی چاوی کوڕی، دەستی لەرزۆکی خستە ملی، باوەشی لە ڕازیشدا، پاشان دەستی خستەوە ملی بڵند، وەك منداڵەکەی جاران خۆی خستە ئامێزی دایکی، با بچینەماڵەوە، پاشان من وکاوە باسی زەردەت بۆ دەکەین، سوپاس بۆ خوای گەورە بەم شێوەیە دەتبینم وگۆچانت فڕێداوە، یاخوا ئەو کوڕە کوردە (سنە)ییە جێی بەهەشت بێت.
گەر نەخۆشییە کوشندەکەی زەردە نەبوایە، دڵخۆشبوونی دایکی دڵخۆشتری دەکرد، جگە لەوەش، بەو نزیکی ئێوارەیە کوچەو کۆڵانی شارەکەی دەکرد وسەردانی مەزاری شەهیدانی دەکرد، بەلاّم نەخۆشی زەردە ئەو خۆشی وهیوایەی لێزەوت کرد.
بەو چاوە (زەردە)ی بینی، هەرچەند بە تەمەن بوو، بەلاّم زۆرجوان بوو، چەندجاریّ بانگیکرد تا هێووری بکاتەوە و بیناسێتەوە، بەلاّم ئەفسوس، نەیناسییەوە، نەیتوانی دڵی دایکی بشکێنیّ کە پێیدەوت وازی لێبێنەو خەمی پێناویّ.ڕاز گوێی لە تەقەی دەرگا بوو (دڵی خورپەیەکی کرد، پێیڕاگەیاند باوکتە).
دەستی کردە ملی ڕاز و دای لە کوڵپەی گریان، وتی زۆر بیرم دەکردن، شارتان لیّ چۆڵکردم، کچەکەم بە تۆوە ماوم ، بینینیت دڵخۆشمدەکا خەمەکانم ڕادەماڵیّ )
ئەو شەوە میوانیّ زۆریان هات، خۆشحاڵی خۆیان بۆ چاکبوونەوەی دەردەبڕی، بەلاّم ئەوەی جێی دڵخۆشکەری بڵند

بوو، (میوانێکی لاوی ڕوحسوکی ڕۆشنبیر)ناوی هێمن بوو، له بواری ڕاگەیاندن کاری دەکرد، بەڵێنی پێدا چاکبوونەوەی چاوی و مرۆیی وگیانی له خۆبردوویی (ئارام)ی جوانه مەرگ زۆر بەرز بنرخێنێ و تەنانەت له ڕاگەیاندنی تێلیفزیۆنی کەناڵه ئاسمانیەکانیش بڵاوی بکاتەوە. شەو درەنگیکرد ومیوانەکان ڕۆیشتن، کاوه جێیهێشتبوون، ڕاز ودایکی چوونه ژوورەکەی دایکی وخۆی ومامی له ژوورەکه مانەوە، خەوی لێنەدەکەوت، خەمی بۆ سەگەکەی زۆر دەخوارد، ئەو سەگەی ژیری و جوانییەکەی سەرنجی خەڵکی ڕاکێشابوو کەچی ئێستێ خەڵکی بێزاربووه لێی ودەڵێن دەبێت له ناوببرێت.
چوو بۆ لای تا بتوانێ وەڕینی کەمبکاتەوە، یا وا بکات بیناسێتەوه نزیکی پەنجەرەکه بووەوە، چاوەکانی بە تەواوی کرابوونەوە، سوور هەڵگەڕابوو، کەف ولیکی لەدەم دەهاتەخوارەوە، دیسانەوه بە پەنجەرەکەوە هەڵگژا، زۆر گوتی زەردە گیان من بڵندم، بێسوود بوو. بەو نیوەشەوە چوو چاکەت و پانتۆڵی لەبەرکرد تا بە جلەکان ئاشنای بێتەوە، دیسانەوە نەیناسییەوە، بیرۆکەیێ بە مێشکیا هات، ئەویش عود ژەنین بوو.
عودەکەی هێنا وئەو ئاوازانەی پێلێدا کە زەردەی بێدەنگ دەکرد ودەیخستە نێو دەریای خەیاڵی تایبەت بە خۆی، حەزی دەکرد بزانێ خەیاڵی سەگەکەی دەبێت چیی بێت، ئاخۆ ئەویش وەك ئێمەی مرۆڤ بیرلە خۆشەویستوکەسەکانی دەکاتەوە؟! بە تەواوی

وەڕیـنی کـەمبووەوە، بـە هـەلیزانی وتـی زەردە. . زەردە، بـەڵام دیسـانەوە بـە دەنگـە دانوسـاوەکەی دەسـتی بـە وەڕیـن کـردەوە، ژەنـینی عودەکـەی دەسـتپێکردەوە، خـۆی لـە پەنجەرەکـە کـردەوە وەڕینی نـەما، دەمـی کردبووەوە، کـەف لـە دەمـی دەهاتـە خـوارێ، زیـاتر و زیـاتر دەیـژەنی، دڵخۆشـبوو دەرمـانی دەردی زەردەی دۆزییەوە، لەگەڵ لێدانی عودەکەی بە دەنگی بەرز بانگی دەکرد، لـەو کاتـە ڕاز هـات وگوتی(بـەم نیوەشـەوە عـود بـۆکێ لێـدەی)، لـە لێـدانی عـود بـەردەوامبوو و لەگەڵیـدا قسـەی بـۆ ڕاز دەکـرد، بـە گەشبینییەوە دەیوت نابینی وازی لە وەڕین هێنا!

ڕاز :لەوانەیـە دوایـی بێـت، نەتـدیووە چـۆن کـەف لـە دەمیـەوە دێتـەدەر. – وا مـەڵێ، زۆر بـە هیـوام سـبەینێ بمناسـێتەوە و نەخۆشییەکەی چاکبێتەوە.

وازی لە عود ژەنین هێنا وبە جووتە تەماشای سەگەکەیان کرد، لە پڕ خـۆی بـە پەنجەرەکـەوە هەڵگژانـدەوە و کەوتـەوە وەڕیـن، بـەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانی بڵنـد و ڕاز بـوو، هـەموو کاتـەکان گـوێی لە ئاوازێکی عودەکە دەبوو، وازی لـە وەڕیـن دەهێنـا .دواجارلەگـەڵ ژەنـینی عودەکـە، کەوتـە نـووزە نـووز، پێدەچـوو ئـازاری هـەبێت، پاڵکـەوت تەماشـایدەکردن، چـەندین ئـاوازی دیکـەی بـۆ لێـدا، چـاوەکانی کـز کردبـوو، جاروبـار هەڵیـدەهێنا وچـەندجارێ دەیپرووکاندەوە وپێڵوەکانی لێکدەنایەوە، مام مەحموود هات وتی چۆنە وەڕینی نەما؟

بڵند بێئەوەی دەست لە ژەنینی عودەکەی هەڵگرێ، گوتی بەو ئاوازانەی کاتی خۆی هەمیشە گوێی لێدەگرتم.تەماشای کرد وگوتی ئەوە نووستووە وازی لێبێنن.

ویستی بچێتە ژوورەوە، دەست بکاتە ملی، بەلاّم هەرخۆی دەیگوت

قسەی مامە نوستووە، ڕوو لە چاکبوونە وسبەینیٚ ئاوازی زۆری بۆ دەژەنم تا بە تەواوی دڵی هێوور بێتەوە، بە ناسینەوەم دڵشاد بێتەوە.

بڵند بەیانی زوو بە ئاگا هاتەوە، دایکی پێیگوت زەردە وەڕینی نەما - دایکە گیان، تەنیا شەویٚ بەم عودە (گوێی لە ئاوازو گۆرانی وسروودی ولاّتەکەی خۆیبوو ئیدی وەڕینی نەما و پاڵکەوت).هەر ئێستە دەچم تا بمناسێتەوە، پاشان دەچم دکتۆرەکەی بۆ دێنم، هەرکە بە تەواوی چاکبووەوە دەیبەمەوە بۆ ولاّتەکەی تا ئەم غوربەتییە نەچێژیٚ.

لە پەنجەرەکەوە چەند جاریٚ بانگیکرد، وەلاّمی نەبوو، لیکوکەفێکی زۆر لە دەمیەوە هاتبووە دەر، چاوەکانی بە تەواوی نوقاندبوو، بە دەنگێکی بەرزتر بانگیکرد هەر بێهوودە بوو، دایکی و ڕاز وباوکی ڕاز بە پەلە هاتن وگوتیان چیی بووە؟.

- نازانم. هیچ وەلاّم وجوڵەی نییە.

- باوکی ڕاز تەماشای کرد و گوتی تۆپیووە.

چەندینجاری دیکە بانگیکرد هەر بێسوود بوو، دەرگای کردەوە بەلاّم دایکی گوتی نەکەی دەستی پێوە دەی، هەر ئێستەش دەبێت فڕێی بدەین.

- دایکە نابێت فڕێی بدەم، دەبێت لە شوێنێکی زۆر خۆش چاڵی بۆ هەڵکەنین.پێوەندیی بە کاوە کرد وگوتی، گەر بە ئەرك نەبێ دەمەوێ خۆت ودکتۆری ڤێتەرنەرییەکە بێن، تا زەردە بپشکنێ.

دکتۆر پشکنی وگوتی تەواو بووە، چونکە ماوەی مانی تووشبووی ئەم نەخۆشییە چل ڕۆژە، بەلاّم ئەم لەبەربە تەمەنییەکەی لەوانەیە زووتر کاری لێکردبێ.

کاوە :ماوەیەکە بەم نەخۆشییەوە دەناڵێنێ.

دکتۆر : دەتوانن لە شوێنێکی دوور بیکەنە ژێر چاڵەوە.

- دکتۆر دەمەوێ بە زمانی ئینگلیزی ڕاپۆرتێکم بۆ بنووسی وتێیدا جۆری نەخۆشی و هۆی لە ناوچوونی زەردە بەیان بکەیت، تا ئەو ڕاپۆرتە بگەیەنمە ولاّتەکەی و دڵنیابن لە هۆی نەمانی.

دکتۆر : ئاژەڵ لەو ولاّتانە پیرۆزە وماف تایبەتیی خۆیان هەیە، منیش ڕاپۆرتەکەت بۆ دەنووسم ودەرمانێکی تایبەتیت بە کاوە بۆ دەنێرم بۆ پاککردنەوەی ئەم ژوورە.

هەموو ئەو هاوڕێیانەی هاتبوون سەریانسووڕمابوو، سەگێك بەو شێوەیە ڕێزی لێدەگیرێ ولە خۆشترین شوێنی نێو باخەکەیان چاڵی بۆ لێدرا وشاردرایەوە.

ئــەوەی جێــی سەرســوڕمانی ڕاز بــوو، کــە هەمیشــە دەیگــوت ودەیگوتــەوە، (چــۆن ئــەم شــوێنەتان هەڵبــژارد، چــەند مــانگیٚ لەمەوبەر لەم شوێنە، نە بستیٚ کەمتر نە زیاتر، ڕوو لە ئاسمان دەیلوراند، بۆنی بە زەوییەکەوە دەکرد، چەندیٚ بانگ دەکرا، وەڵامی نەبوو لە لوراندنی وەکو گورگیٚ بەردەوامدەبوو!!).

بڵند :براینە سەرتان سوڕنەمینیٚ بڵێم، ئەم سەگە بە دوور کەوتنەوەی لە وڵاتەکەی ومانگ و نیٚویٚکی دوورکەوتنەوەی من، تووشی نەخۆشی هاریکرد و بەم ڕۆژەی گەیاند.هاوڕێیەکی کاوە وتی بیرم دێت کاتی کیمیابارانەکە، ئاژەڵ و باڵندەکان سەریان لێشێوا بوو، ئەوانیش نەیاندەزانی چیی بکەن وبەرەو کویٚ ڕابکەن، هەموویان فەوتان، بەڵام بە داخەوە کەس هەر باسیان ناکات و تەنانەت شوێنێکی تایبەتیان بۆ دانەنرا تا زیاتر تاوانەکانی ڕژێم دەربکەوتایە.

هاوڕێیەکی دیکە وتی کاك بڵند حەڤدە ساڵ لە دەرەوە ژیاوە وتەنیا سەگێکە وهێند ڕێزی لێدەگریٚ، کەچی بە هەزارەها ئاژەڵ وباڵندە فەوتان کەچی نەك دابینکردنی شوێنێکی تایبەت بۆیان تەنانەت لە کەناڵەکانیش باسیان هەر نەکراو ناکریٚ.

بڵند : لە وڵاتان، شوێنی تایبەتی هەیە وتەنانەت خاوەنەکانیان سەردانیان دەکەن، گوڵیان بۆ دەبەن.

هەستیکرد بە گرینگیدانی بۆ زەردە ودڵتەنگبوونی، ئەوانیشی دڵتەنگ کردبوو زۆر بە ڕێزەوە دەیانگوت (هاوبەشی خەمتین).

بڵند وڕاز زۆر سوپاسی ئەرك وماندووبونیان كردن.ئیدی زەردەیان لە سێبەری داری نێو باخەكەیان جێهێشت.
(تا لە ژیان بوو، هەمیشە لە ژەنینی ئەو ئاوازانەی بە ئامادەبوونی زەردە دەیـژەنی، بـەردەوامبوو فەرامۆشـی نـەدەكرد، زۆر جاریش لەگەڵ ژەنینی هەر ئاوازێك فرمێسك بارانی عودەكەی دەكرد).

پاش مانگێ لـە هاتنـەوەیان، ئـەو ئێوارەیـە ڕاز زوو زوو بـە جێـی دەهێشتن، لەگەڕانەوەیشی ڕەنگە سووروئاڵەكەی زەرد دەچووەوە، پـورە پـیرۆزی دایكـی بڵنـد زووتـر هەسـتیپێكرد وگـوتی كچـەكەم پێدەچێ نەخۆش بیت؟
ڕاز :كەمێ دڵم تێكدەچێ و ئەڕشێمەوە .
پورەپیرۆز، ئەم وەڵامـەی بیسـت بە ڕوویـەكی خۆشـەوە چرپاندییە بنگـوێی ڕاز.شـەرمێكی لـە ناكـاو ڕەنگـی سـوور هەڵگەڕانـد، بڵنـد وبـاوكی هەسـتیان پێكـرد، ئـەویش كـە زانـی، نـەیتوانی دابنیشـێ وهەستا، كەوتە دووی وگوتی چییە، دایكم چیی پێگوتی؟
- دایـــە پێیوتم(نیشـــانەی دڵتێكچـــوونەكەت (دووگیانیـــت) پێشاندەدات.
لە خۆشیان باوەشێكی لێدا وبەڵام وتـی (ناتوانم بتگوشـم نـەوەكو ئـازاری كۆرپەكـەمان بـدەم)، هەرسـبەینێ بـۆ دكتـۆر دەچـین تـا دڵنیاتربین.

بەیانی زوو، لە دەنگی دایکی بە ئاگا هات، لەگەڵ ئایەت خوێندن ونزاکردن، خواردنی ئامادە دەکرد، مام مەحمود وەك کاری ئاسایی، بەیانیان زوو دەچووە مزگەوت وپاشان پیاسەی نێو شاری دەکرد و تا درەنگ نەدەگەڕایەوە.
بڵند: دەمەوێ ئەوڕۆ لەگەڵ ڕاز بچین بۆ دکتۆر تا بزانین ئەم دڵتێکچوونەی چییە؟
- کوڕەکەم، ئینشەلاڵ خوا منداڵێکی جوانمان دەداتێ، هێند ناسك وجوان وەك جوانی منداڵی خۆت، شەوێ لەبەر باوکی ڕاز قسەم نەکرد، دەنا هەرشەو پێمدەگوتی (ڕاز دوو گیانە).
هێند بە پەلە چوونە دکتۆر وهاتنەوە، باوکی ڕاز تازە گەیشتبوو نانی بەیانی دەخوارد. هەر لە دوورەوە پوورە پیرۆز چووە پێشیان، مژدەبەخشی بە ڕوویانەوە دیاربوو، بێوەلامی ئەوان، کوڵمەکانی سوور هەڵگەڕان ولۆچیی ڕووخساری پیری نەهێشت، ( ڕازەکەم نەمگوت دوو گیانی).
یەکسەر ڕاز گوتی ئەی باوکم لە کوێیە؟حەز ناکەم ئەو بزانێ، کەی سکم بەرزبووەوە خۆی تێدەگات.
لە پشتەوە وەستابوو، گوێی لێیانبوو، دەستی بە ڕیشە سپیەکەیدا هێنا وگوتی سوپاس بۆ خوا، نێوچەوانی ڕازی ماچکرد وئەویش دەستی ماچکرد.
پورە پیرۆزگوتی لەمەولا چیی ئیشوکاری ماڵ هەیە من دەیکەم، نامەوێ خۆت ماندووبکەیت، نەڵێن پیرە، ئێستەش لە کچێکی چواردە ساڵە کارەکانی نێو ماڵ باشتر ئەنجامدەدەم.

بڵند بە پێکەنینەوە( دایکە هەندێك لە ئیشەکان بە من بسپێرە).
ڕاز :دایکە چۆن دڵم دێ تۆ کار بکەیت ومن دانیشم.
– تۆ ئازابەو پارێزگاری خۆت بکە، مناڵمان بۆ بێنە دونیاوە با جارێکی دیکە سەرخوانمان بە قەرەباڵغی ببینمەوە، پاشان با بمرم. – ئینشەلاّ نامری وخوا بۆ ئێمەت دێڵێ.
بەیانی بڵند بۆ جاری یەکەمی بوو، بە دەنگی دایکی هەڵنەستێ، لە دڵی خۆیدا گوتی لەوانەیە زۆر بە ئاسپایی هەستابێ تا ڕاز بە ئاگا نەیەت وتێر بنوێ.چووە مەتبەخەکەوە چای لەسەر تەباخ نەبینی، مامیشی چوو بووە دەرەوە، بانگی دایکی کرد، وەلاّم نەبوو، چووە ژوورەکەی نووستبوو، سەیری پێدەهات، هیچ کات وا نەنووستووە دووبارە بانگیکرد وەلاّمی نەبوو، حەزی نەکرد بانگی بکاتەوە وگوتی ئەمیش بەم پیرییەوە زۆر ماندووە بە دەستمانەوە، یەکدوو هەنگاوێ ڕۆیشت، خورپەیەك بە دڵیدا هات، ترسا، بە پەلە گەڕایەوە و خۆی گەیاندێ، دڵ و دەستی دەلەرزین، بەلاّم زۆر لەسەرخۆ وبە نەرمی، وتی دایکە.دایەگیان.. هەستە.نەدەنگ نە جووڵە، کە بینی دایکی چاوەکانی کرابوونەوە، پڕ بە دەم هاواریکرد، دایکە گیان. . . . دایکە. بەلاّم، پێدەچوو لە مێژ بووبێ زۆر بە ئاسپایی گیانی سپاردبێ، چاوەکانی مابوون ولە چاوەڕوانیدا بوون تا جارێکی دیکە سەر خوان قەرەباڵغ بێتەوە، بەلاّم چیدەکەیت لەگەڵ مەرگی ناوادە !!............

## (١٣)

## کۆرپە

بە تەواوی سکی بەرزببووەوە، بڵند گوتی گەر دایکم بمایە زۆر دڵخۆشدەبوو، فریامانیش دەکەوت، بەلاّم ماڵ کاوە و پورە زەینەب، ببوونە دوو فریشتە ولە کاتی منداڵبوون فریایان کەوتن، وێڕای ئەوەی منداڵبوونێکی مەترسیداربوو بە تایبەت ڕاز هەناسە تەنگییەکەی زۆر زیادی کردبوو، پاش چەند کاتژمێرێکی دوای بوونی کۆرپەکەیان، ناوی (شنرویَ)یان لێنا، ئەو ناوەی لە مێژبوو پێکەوە لەسەری ڕێکەوتبوون.

چاوودڵی مام مەحمود بە بینینی شنرویَ ڕوونبووەوە.

هەفتەییَ چرۆی خێزانی کاوە، پورە زەینەب لایان دەمانەوە.

مام مەحمود لەگەڵ هاتنی شنرویَ بۆ باوەشی خێزانیان، بە تەواوی هۆگری ببوو وایدەزانی یەکیَ لە منداڵە شەهیدەکانی گەڕاونەتەوە. ئەوەی بڵندی زۆر نیگەران کردبوو، نەخۆشی هەناسە تەنگی ڕاز بوو، تەنانەت شنرویَ کە شیری دەخوارد، زۆر جار ڕاز لەبەر هەناسە تەنگی چەندینجار لە دەمی دەیکردەوە، تا تێری دەکرد (شنرویَ) فرمێسکی وەك نمەی باران بە سەر ڕوومەتە ناسکەکەی دەهاتە خواریَ، هێندەی شیرەکەی بەری دایکی فرمێسکی دەڕشت.

ئەو هەناسە تەنگییە ببووە نەخۆشییەکی هەمیشەیی وزۆرجار لە شیرینی خەوا هەڵیدەساند، بە تایبەت پاش بوونی (شنروێ)، زۆر تێکدەچوو، تەنیا ئەو بەخاخەی دکتۆر بۆی دانابوو فریای دەکەوت.

( ١٤ )

## گێژەڵۆکەی نەگبەتیی

شــار ســوور هەڵگــەڕابوو، ئــەو شــارەی کەشــوهەواو ڕەز و بــاخ ودارســتانی هەمیشــە ژینگــەی شــاری خۆشــکردبوو، کیمیابــاران ئــاڵۆزی کــرد وکردبوویــە ژینگەیــەکی ژەهــراوی، وا ئێســتەش گێژەڵۆکــەیێ ئاســمــانی شــاری گرتــووە لــە ژێــر دەرگــاو پەنجەرەکانــەوە، خــۆی دەکــردە ژووری هــەموو مــاڵێ، شــوێن پێهــەڵگری کیمیایەکــە بــوو، خــەڵکانێ زۆری خســتە نێــو ئەمبۆلانسەکانی نەخۆشخانەکانەوە، ڕاز لەو گێژەڵۆکەیە بێبەش نــەبوو، تــا دەهــات نەخۆشــییەکەی تــەنگی پێهەڵدەچــنی وبەخاخەکەی سوودی نەما بوو.سوور هەڵگەڕابوو، ئەم گێژەڵۆکەیە هێنــدەی کیمیابارانەکــە شــاری شــڵەژاندبوو، کــاوە لــە پــێش ئەمبوولانســەکان فریایانکــەوت، (گــوتی دەمزانــی ڕاز ئێســتە پەرێشانە)، شنرویێ وباپیریان جێهێشت. دیسانەوە بە هاواری خەڵکی شارەکەی گوێی زرینگایەوە، ترس بیناقاقای گرتبوو، قوڕگی وشك کردبوو، خۆڵبارینەکە وەك کیمیایەکە وەك خەردەل وسیانید، بە خوڕ ئاوی بە چاوی ڕاز دەهێنا، ڕووخساری سوور

هەڵگەڕاندبوو، لەگەڵ سپاردنی گیانی پاکی هەر نەخۆشێکی نزیکیان، لەرزینی بە چۆك وڕاچڵەکاندنی دڵی پیا دەهێنا.
کاوە عەودالّی هێنانی بوتڵی ئۆکسجین بوو، زۆرجار یەك ڕیز نەخۆش یەك بووتڵێکیان بەسەر دابەشدەکردن، (هەر یەکەو پێنج خولەکێ تا لە مردن ڕزگار ببن). دەستی لە نێو دەستی ڕاز بوو، نەیدەهێشت پاڵبکەوێ، چونکە پاڵکەوتنەکە خراپتری لێدەکرد، ڕاز توند دەستی بڵندی دەگوشی وبە چاوەکانی قسەی لەگەڵ دەکرد، تەماشای قەرەوێڵەی تەنیشتی کرد چارەکێ دەبوو نەخۆشەکەی سەری گیانی لە دەستدابوو، بە شین وهاوارەوە بردیانەوە، پاشان ئاوڕی لە بڵند دایەوە، زۆر سەرنجیدەدا، دەستی توندتر دەگوشی وبە دوو دڵۆپ فرمێسك تێیگەیاند ئەویش نزیکی مەرگ بووەتەوە، دوو دڵۆپی ئاسایی نەبوون، تێزاب ئاسا کاریان لە جەرگودڵی بڵند دەکرد، دڵۆپێکیان پڕ لە خۆزگەو ئاوات، ئەویدی وێنەی شنرویێ لە خۆ گرتبوو.
دوو پەرستیارەکە وکاوە، بە بوتڵێکی ئۆکسجینەوە دەهاتن، هەردووکیان بە تاسەوە دەیانڕوانییە بوتڵەکە، (لە گێژاوێکی ئاودا بوون، لە نزیك خنکاندا دەستیان بۆ پوشێك دەبرد تا لە خنکان ڕزگاریان بکات).نایە سەردەمی وتا توانی هەڵیدەمژی، دە خولەکێ بەردەوامبوو، بەڵام گێچی سەر بوتڵەکە ڕوو لە سفر بوو، داوایانکرد بوتڵی دیکەیان فریا بخەن، گوتیان وا چوونە لە نەخۆشخانەکانی دەرەوەی شار پەیدای بکەن، بەڵام هێشتا

نەگەڕاونەتەوە، کەمامەی بوتڵەکەیان لێکردەوە ودەرزیەکیان لێداو جێیان هێشتن. کپوبێدەنگ، تەنیا بە چاو یەکدیان تێدەگەیاند، نە بڵند نە کاوە حەزیان نەدەکرد قسەی لەگەڵ بکەن، بەڵام خۆی کەوتە قسەو گوتی ( بڵند گیان تەندروستیم باش نییە، ئاگاداری شنرویَ وباوکم بە، کاوە گیان تۆش برای منی ئاگاداری بڵند. . شنرویَ وباوکم بە)، ئەم وتانەی لەگەڵ فرمێسکە گەشەکانی مەلەیان دەکرد، زۆر بەزەیی بە خۆیدا هاتەوە وهەناسە تەنگییەکەی دەستی پێکردەوە، بڵند دەیگوت کەی کاتی ئەم قسانەیە ودڵی خۆت تەنگدەکەیت. لەبەر توندی هەناسە تەنگییەکەی ولرخەی سینگ وکۆکەی بەتینی لەگەڵیدا لیکی لێدەهات، دەپلیکایەوە، کاوە بە ڕاکردن ڕۆیی تا ئۆکسجین پەیدا بکا.ڕاز ئارەقیَ زۆری کرد، چاوەکانی کرابوونەوە، ڕەنگی هێند سوور هەڵگەڕابوو، وەك یەکیَ دەستی لە بیناقاقای نابیَ.بڵند ئارەقی نێوچەوانی سڕییەوە، گوتی خۆگربە هەر ئێستە لە شارەکانەوە ئۆکسجینمان فریا دەخەن.ویستی پاڵکەوێت نەیهێشت تا خراپتر نەبێت.بۆ تۆزێك ئۆکسجین پەرێشانبوو، دەنگی لرخەکەی لە قاوشەکە دەنگی دەدایەوە، ترساندی، بڵند زۆر ترسا، چونکە نیشانەکانی نەخۆشە گیان لە دەستچووەکانی قاوشەکەی تیا بەدیکرد، باوەشی بۆ کردەوە ودەستەکانی لە پشتی بڵند گیرکردبوو، لرخەیەکی دیکەی کرد، دەنگی نەما، دەستەکانی شلبوونەوە، ملی بەسەر شانیا لاربووەوە، پاڵیخست،

چەند شەپازلەیەکی لە ڕوومەتیدا کە بۆ یەکەمجاربوو شەپازلە لە ڕوومەتە ناسکەکەی بدات، کەمێ وەرزشی پێکرد وایزانی بووراوەتەوە، بوتڵی ئۆکسجینی نەخۆشێکی ئەوسەر قاوشەکەیان بۆ هێنان، بەڵام پاشئەوەی پێویستی پێنەبوو فریایان خستن، گیانی پاکی سپاردبوو، بە پەلە کەسوکاری نەخۆشەکە هاتن بۆ بوتڵەکە گوتیان نەخۆشەکەمان زۆر هیلاکە ئەم تازە گیانی سپاردووە با فریای ئەوەی ئێمە بکەون، بەڵام تا گەیاندیان ئەویش گیانی سپاردوو فریای نەکەوتن.

(هەموو خەڵکی هاواریان بوو، دەیانگوت دەبوایە باشترین نەخۆشخانە لە شارەکەمان هەبوایە، خۆ حکومەت دەزانێ خەڵکی شارەکەمان ناتەندروستە، بۆ فریامان ناکەون؟!!تەنیا لەساڵیادی کیمیاباران لە بیریانین)، جووڵەی بۆ نەدەکرا، تەزیبوو، دیمەنی ڕاز نوستنێکی تا هەتایی بوو، داخستنی پێڵوەکانی لە لایەن کاوە، داخستنی ئەلبوومی ژیانی شیرین وتاڵی ڕاز بوو.

ماڵێکی سارد وسڕ، بێ(ڕاز)، بێ (دایک)، بێ (خوشک)، تەنیا شنرویَ تاکە هیوا بوو، چرۆ بوو بە دایکی وکاوە باوکێ دیکەی.

دەیویست ماڵێکی گەرموگوڕ لە تەنیشت ڕاز ودایکیەوە دروست بکات تا هەتایە پێکەوەبن، شنرویَ، ڕاسپاردەکانی ڕاز و دایکی، دوو دەنگی غەیبی بوون وئامۆژگارییان دەکرد، تا بیر لە دراوسێتییان نەکاتەوە.دەیویست مامی نەڕوات وجێینەهێڵێ، بەڵام جێیهێشت.وێڕای ئەوەی چەندجارێ لەگەڵ کاوە بۆ لای

پزیشــك بردبوویــان، بــەڵام بێســوودبوو، لەچــکێکی ســپی وەك ڕیشــەکەی لەســەردەکرد، کوچــەوکۆڵانەکانی شــاری بــە شــەوان دەکرد، تا نیوەشەو نەدەگەڕایەوە، وێڕای ئەوەی بە تەواوی وشەی (شــێت)ی لــە خۆگرتبــوو، بــەڵام خــەڵکی وەکــو کەســێ شــێت تەماشــایان نــەدەکرد ، بــەزەییان پێــدەهات، جاروبــار وەك کەســێ ئاســایی لێــدەهات، لەناوەڕاســت بــازاڕی شــار، هاواریــدەکرد ودەیگــوت کەســەکانمان نــەمردوون، شــەهیدان نــامرن لــە نێــو ماڵــەکانمانن، دڵنیــابن وەکــو ئێمــە لــە شــار دەســوڕێنەوە، مەترســن ئەوان پشت وپەنامانن.خەڵکی بەو وتــارەی دڵیــان خۆشــدەبوو، لــە هەمانکاتدا بەزەییان پێدەهاتەوەو ئەوانیشی دەخستە نێو دەریای خەیاڵــەوە، بــەڵام هەمیشــە ڕووگەشــی خۆیــان پێشــاندەدا وڕێــزی تایبەتیان لێدەگرت.

بڵنــد دەیویســت بچێتەوە بــۆ هەنــدەران ومامەڵــەی شــنروێ تــەواو بکات، ئەو وڵاتە بۆ خزمەتی منداڵ دروستببوو، پەروەردەی جوان و زانیــاری باشــیان لــە کاســێتی بــەتاڵی منداڵــدا تۆمــاردەکرد، بــەڵام مامەی بەسەر کێ جێبێڵێ، چۆن شنروێ لە چرۆی دایك بکات.

ئەو ئێوارەیە بڵند وتی کاوە با بچین بۆ لای مامم تا نەڕۆیشتووەتە دەرەوە، شنروێ لەگەڵ خۆمــان دەبــەین بــەڵکو دڵــی باشــبێ وکــەمێ خۆشی بچێتە دڵە پڕ ئازارەکەیەوە، چرۆ گوتی منیش دێم.

چــوونە ژوورەوە، برۆکــانی بــە تــەواوی زیــت ببوونــەوەو هاتبوونــە پێشەوە چاوەکانی خستبووە قوڵاییــەوە، بەســەر لێــوێکی وشــکەوە

زەردەخەنەیەکی کردو تەزووی بە لەشیاندا هێنا، بەلاَم چرۆ هەر تەزوو نەبوو ڕەنگیشی زەرد هەڵگەڕا، باوەشی بۆ شنرویَ کردەوە وله باوەشی گرت، دەستی بە لێوی شنرویَ هێنا تا یاری بۆ بکاو پێبکەنیَ، بەلاَم شنرویَ زریکاندی، ڕوخساری مام مەحمود زۆر گرژ بوو، چرۆ گوتی مامە بمدەریَ، دڵت هیچ نەکات شنرویَ بۆ لای هیچ کەس ناچیَ، یەکسەر لێیوەرگرت، (تا ئێستە فەرمووی دانیشتنی لێنەکردبوون) بە دەنگێکی گریاناوی وپڕ گلەیی وگازەندەوە وتی: کچەزامە و سڵم لێدەکاتەوە، تاکەکەسە دڵم پێیخۆشبێت.

بڵند: مامە با دانیشین.

بێدەنگ لە شوێنی خۆی دانیشت، ئەوانیش بێدەنگ لە تەنیشتیەوە دانیشتن.

کاوە :مام مەحمود هەست ناکەیت باشتری، ئێمە وا هەستدەکەین ئەوڕۆ ڕەنگ وڕووت باشتر بووە، بڵند و چرۆش پاڵپشتییان لەو قسەیەکرد.

– بۆ باشتر بم، چاوەڕوان مەرگمە ساتیَ زووتر بیَ، بەلاَم نازانم بۆ دیارنییە . . . نازانم. . دای لە کوڵپەی گریان، هەموو بۆی گریان.

(شنرویَ)ش دیسانەوە دای لە زریکە، مام مەحمود بە دەنگێکی گڕ وبەرز هاواریکرد وتی قوربانتبم مەگری با زیاتر ئازار نەچێژی، دای لە نێو چەوانی خۆی.بڵند دەستی گرت، چ دەستێك!!زۆر بە هێز، توانای بڵند بە سەریدا ناشکا وکاوە ش هاوکاری کرد تا

زیاتر بە نێوچەوانی خۆیدا نەکێشێ.بڵند بە چرۆی گوت تۆ بە پەلە بڕۆوە شنرویێ بەرەوە، من وکاوە لێرە دەمێنینەوە.

کپبووەوە، تا لە دەرگای حەوش دەرچوون مام مەحمود سەری هەڵبڕی بوو هەر تەماشای دەکردن.

کاوە: مامە نوێژەکانت دەکەیت؟

بە قینەوە تەماشای کردن، زانییان خەریکە تێکدەچێتەوە، وەڵامی نەدایەوە ، سەری داخستبوو، تەماشای خاڵێکی تایبەتی پڕ لە خەیاڵ، پڕ لە کارەساتی دەکرد، پاشان تەماشای بنمیچی خانووەکەی کرد، (بڵند لە دڵی خۆیدا دەیگوت لەوانەیە شتێکی بینیبێ، خۆ دەڵێن مرۆڤ کاتی نزیك گیان سپاردنی فریشتەکان دەبینێ)، کاوە تەماشای بڵندی کرد، بڵند تێگەیشت ئەویش لەم هەڵسوکەوتەی مام مەحمود سەری سوڕماوە.ئەمجارەیان هەستایە سەرپێ وهەر بە نێو ژوورەکەیا پیاسەی خۆی دەکرد.

بڵند:مامە گیان چیتدەوێ بۆتی بکەین، حەزت بە چییە هەر ئێستە بۆتی بێنین؟!

سەری بەملاولادا ڕاوەشاند، سەرنجێکیدان و زەردەخەنەیەکی بۆ کردن، وەك کەسێکی ئاسایی وتی(ئەوانەی لە سێدارە دەدرێن، پێش سێدارەدان پێیاندەڵێن چیتان ئەوێت تا پێش مەرگت جێبەجێبکەین).پرسیاری ئێوەش وا دێتە پێشچاو، بەردەوام بوو دەمەوێ سبەی بەرگی سپی لەبەر بکەم، بەو بەرگە پیاسەی کوچە

و کۆڵانەکانی شار بکەم، پاشان بچمە لای ڕاز ی کچم وسەردانی بکەم.
کاوە :بۆ سپی؟ قوماشی جوانتر هەیە، سپی زوو پیس دەبێت..
– مەترسە خۆم خاوێن ڕادەگرم، دەمەوێ ئێستە بچمە دەرەوە دڵم تەنگە، دەمەوێ پیاسەیەکی خۆشی نێو شارەکەم بکەم، هاوڕێکانم ببینم، ئێوەش بڕۆنەوە، سبەینێ بەرگە سپییەکەم لە بیر نەکەن.
ئەو ڕۆیشت وجێیهێشتن.بڵند وکاوە بە سەرسوڕمانەوەماڵەکەیان جێهێشت.کاوە گوتی قسەکانی زۆر سەیربوون، بڵند گوتی لەوانەیە شەوان خەڵکانێ ببینێ جلیان سپی بێ، بەلاّم ئێمە نایانبینین، هەر بەیانی خۆی دەبەین بۆ بازاڕ وبە دڵی خۆی کراسە سپییەکەی بۆ دەکڕین.کاوە نەیهێشت بڵند بچێتەوە، خۆیشی بە هۆی دووجار زریکاندنەکەی شنرۆێ، دڵی نە دەهات بڕوات.
شەوێ درەنگ لەسەر بانەوە تەماشای ماڵی مامی دەکرد، کۆلاّنێکی ئەودیوی ماڵی کاوە بوو، بەلاّم تا درەنگ هەر نەگەڕایەوە، وەڕەس بوو وچووە خوارەوە.
بەیانی زوو هەستا وتی کاوە گیان با زوو نانبخۆین بچین بە دوای مامم، تا بەرگی بۆ بکڕین، چونکە ئەمشەو خەونم پێوەی بینیووە، دەزانم پەلەی جلەکەیەتی.
لەگەڵ کاوە چوون، دەرگا کراوە بوو، کاوە گوتی لەوانەیە ڕۆیشتبێ،

با بچین لە نێو حەوشە چاوەڕوانیبین، دەرگای ژوورەکەی پێوەدرا بوو، لە دیوی ناوەوەش کلیل درابوو، لە دەرگایاندا دەنگ نەبوو، بڵند :دڵنیابە ڕۆیشتووە.

کاوە بە دەم قسەکردنەوە بەرەو لای پەنجەرەی ژوورەکە دەچوو و دەیگوت دەبێت بەم بەیانییە بۆ کویٚ چووبیٚ، لە پەنجەرەکەوە، بە یەکەم تەماشا، کاوە هاواری لێبڵند بوو، گوتی قوربانتبم مام مەحمود گیان بۆ وات لە خۆت کرد؟!

بڵند : چیی بووە؟!

کاوە :خۆی خنکاندووە !!.

دراوسێکان کۆبوونەوە وبە هەموو، دەرگاکەیان شکاند.

زمانی دەرچووبووە دەرەوە، کەف بە دەمیدا هاتبووە خوارەوە وملی درێژ وباریك ببووەوە، چاوەکانی دەرپۆقیبوون، دوا دیمەنی ئازار ونەهامەتیەکانی تۆماردەکرد.

پەتەکەیان لە ملی کردەوە، پاڵیانخست، هەموو حەپەسابوون، بڵند وتی مامە گیان، دیاربوو هەر شەو بڕیارتدابوو، داوای بەرگی سپیت لێکردین، نەماندەزانی داوای کفنمان لێدەکەیت، بڕیاری مەرگت بۆ خۆت هەڵبژاردبوو.

ئەوەی جێی سەرنج بوو وێڕای ئەوەی شێت بوو، بەلاّم شار هەموو تێیئالاّبوون، بە مەراسیمێکی جوان، بە کوچەو کۆلاّن وبازاڕ، ئەو بازاڕەی لەو ڕۆژەدا هەموو دوکانیان داخستبوو، لە مەراسیمەکەدا

بەشداربوون، زۆربەی خەڵکی خەونیان پێوە بینیبوو، زۆر بە پیرۆزیان دەزانی.
یەکێ دەیوت لە خەونمدا دەستی لە ملی ڕاز وهەموو کەسەکانیدا بوو، بە دڵخۆشی بەرەو چیای شنرویێ دەڕۆیشتن.
یەکێکی دی دەیگوت لە خەونمدا شەهیدانی کیمیاباران لە شاخی باڵبۆ وشنرویێ وهەورامانەوە دەهاتن بۆ پێشوازی مام مەحمود.
یەکێکی دی دەیگوت بە چاوی خۆم بینیم پیاوێ نورانی بە جلوبەرگو ڕیشی سپییەوە، بە زەردەخەنەیەکی بێوێنەوە پێشوازی لێدەکرد وکلیلێکی پێبەخشی، دەستی لە ملی کرد وبەرەو دەرگایێ دەیبرد).گەر لە بازاڕ یەکێ بیگوتایە خەونم بە مام مەحمودەوە بینیووە، چەندین کەسی دیکە دەیانوت ئێمەش خەونمان پێوەی بینیووە.خەونەکان دەلیل بوون بۆ گەیشتنی بە شەهیدان، بەڵام ئەوەی زۆر جێی سەرنج بوو، خەونێکی بڵند کە بۆ چرۆ وکاوە ی دەگێڕایەوە، (مامم بینی بن دار هەنارەکانی شیدەکردەوە، پێیگوتم ئاگاداری ڕەزو باخی هەردوولامان بە، باخەکەی ئێمە پێشکەشە بە شنرویێ، گرینگیبدەن بە بوژانەوەی باخەکانی شارەکەمان).
پاش ماوەیێ لە بە خاکسپاردنی خەزووری.بیریکردەوە ئەمجارەیان بگەڕێتەوە بۆ هەندەران، مامەڵەی شنرویێ لەو وڵاتە تەواو بکات.کاوەی هێنایە ئەو بڕوایەی ڕازی بێت بە بردنی

شنرویٚ بۆ هەندەران، بەلاٚم نەیتوانی بە چرۆ بلٚیٚ وئەو ئەرکەی بە کاوە سپارد.

پاش گەیشتنی بە هەندەران. تا ڕاپۆرتی ڤیتەرنەرییەکە بۆ هۆی لەناوچوونی زەردە بسەلمیٚنیٚ.( گەر ڕاپۆرتەکەی نەگەیاندبایە بە دلٚنیاییەوە مافی پەناهەندەییان لیٚوەردەگرتەوە)، بەلاٚم پیٚدانی ئەو ڕاپۆرتە ڕاستگۆیی وبە وەفایی بلٚندی بۆ ئەو ولاٚتە سەلماند ولە لایەن کۆمەلٚەی نابینایانەوە پشتگیریی لیٚکرا بە پیٚدانی خانوویەك و وەرگرتنی شنرویٚی کوڕی وەك مندالٚیٚکی ئەو ولاٚتە.

خۆی سەردانی(ئالان ونیان)یکرد، پیرۆزبایی لە ئالان کرد بە وەرگرتنی مافی پەناهەندەییەکەی.ئەوانیش خۆشحالٚبوون بەڕواندنی چاوەکەی، بەلاٚم دلٚتەنگبوون بە بەسەرهاتە دلٚتەزیٚنەکانی لە ماوەیەکی وا کورتدا.ئەوەی وایلیٚکرد بۆ جاری دووەم نیٚو چەوانی نیان ماچبکات، نیان گوتبووی دەزانم ولەگەلٚتدام دەلٚیٚی(ئەوەی نیگەرانی کردووم، چۆن بتوانم شنرویٚ لە (چرۆ) وەرگرم، بەلاٚم ئەو ئەرکە بە خوشکی خۆت بسپیٚرە)، چونکە بەم نزیکانە من وئالان دەگەڕیٚینەوە کوردستان، تۆش کاتی چوون وگەڕانەوەت لەگەلٚ ئیٚمەدا ڕیٚکبخە.

توانی یەکجاری دیکە بۆ لای بەردی پیرۆز بچیٚت، چونکە لەگەلٚ هەرچوونیٚکی وباسی دەردەدلٚی خۆی، بەردی پیرۆز بۆ داستانی پڕ نەهامەتی ونائومیٚدی شارەکەی بلٚند (خۆی بۆ نەدەگیراو دەتوایەوە!) زۆر بچووك ببووەوە.

پاش گەڕانەوەی بۆ نیشتیمان بە مۆڵەتی یەك مانگ، ئەوەی دڵخۆشیکرد، هۆگربوونی شنرویٚ بوو بە بڵندەوە، ویٚڕای ئەوەی کاوە وتی چرۆ بە نهیٚنی زۆر بۆ شنرویٚ دەگری، بەلاٚم دڵمداوەتەوەو گوتوومە (لە دوو بنەماڵە تەنیا ئەم کوڕەیان بۆ ماوە، هەر بۆیە دەیەویٚ گرنگی زۆری پیٚبداو بە دواڕۆژیٚکی ڕوونەوە بیهیٚنیٚتەوە کوردستان وخزمەتی شارەکەمان بکات).
ئەو بەیانییە زۆر زوو هەستا، سیەمین ڕۆژی مۆڵەتەکەیان بوو، ئەو ڕۆژە دەبوایە (یەك)ی پاش نیوەڕۆ بگەیشتنایە فڕۆکەخانە، بەو بەیانییە زووە لەگەڵ کاوە چوون بۆ مالاٚوا بوون لە دایکی وڕاز وباوکی ڕاز وشەونم وشەهید هەلۆ وکەسوکارانی.پیٚی گوتن شنرویٚ دەبەم تا بە باشترین بڕوانامەوە بیگەڕیٚنمەوە شارەکەمان.
چاوەکانی لیٚدەشاردەوە، بەلاٚم ئاوساوی و سوورهەڵگەڕانی نەدەشاردرایەوە، نەیتوانی بیدویٚنیٚ، دەیزانی وەك گرمەی هەوری بەهاری لیٚدیٚ ولەگەڵ هەر قسەیەك، فرمیٚسك بە خوڕ هەڵدەقووڵیٚت وچاوەکانی بە یەکجاری سووردەکات.
لە نیٚو ئۆتۆمبیلەکەی کاوە گڕوگاڵی شنرویٚ کەشی بیٚدەنگی شکاند، گوتی چرۆی خوشکم داوای لیٚبوردنت لیٚدەکەم بە هۆی ئیٚمەوە ئازار دەچیٚژیت.نەیتوانی وەلاٚمبداتەوە، بە فرمیٚسك وهەنسکدان وەلاٚمی دایەوە.
(ئالان ونیان)یان بینی لە فڕۆکەخانەکە، جیٚشەپۆلی ئەشکی مالاٚوایی هیٚشتا بە ڕوویانەوە دیاربو، نیان لە چرۆ نزیکبووەوە

قسەی لەگەڵ دەکرد، دڵیدەدایەوە، بڵند وئالان وکاوە، بێدەنگ وەستابوون، جاروبار گەر دەمەتەقێ دروستبووایە لە چەند وشەیەك زیاتر تێناپەڕی، هێند ماڵاواییەکە ناخۆش وگرانبوو، بە تایبەت هەموو چاوەڕوان دیمەنی دڵتەزێنی وەرگرتنی شنرویێ بوون لەلایەن (نیان)ەوە.
جگە لەوەی قسەی لەگەڵ چرۆ دەکرد، جاروبار یاری لەگەڵ شنرویێ دەکرد تا وایلێبکات بە ئاسانی بچێتە لای، بڵندگۆ بانگی کردن، نیان زیاتر چووە پێشەوە وباوەشی بۆ شنرویێ گرتەوە.وەك ئەوەی بزانێ پیلانێکە بۆ لە باوەش لابرنی دایە چرۆی، توند باوەشی لە چرۆدا، دەستە خنجیلەکەی کردە ملی، نیان چووە پشتی چرۆوە ودەستی بۆ برد ئەمجارەیان وەك بێچووی کەروێشك خۆی خستە سەرسینگی دایکییەوە، چاوە قاوەیی وخڕ وخنجیلەکەی دەپروکان، بڵندگۆکە بانگیکردنەوە، نیان بە ئاسپایی دەستی بۆ برد وهەر چەندە شنرویێ خۆی ڕادەپسکاند، بەڵام ئەمجارەیان چاری نەبوو، چرۆ هاوکاری کرد وبە زریکەوە نیان لە باوەشی کرد ودوو ماچی چرۆی کرد وبە چەند هەنگاوێکی پەلە خۆی دوور خستەوە.
کاوە بە پەلە خۆی گەیاندە چرۆ، بڵند خۆیگەیاند و باوەشی بە چرۆ وکاوەدا کردبوو، تا ئالان لە شانی نەدا ونەیگوت درەنگ دەکەوین، ماڵاوایی لێنەدەکردن.تا دوورکەوتەوە هەر ئاوڕی لێدەدانەوە، زۆر دەترسا لە چرۆ شتێکی لێبێت.

نیان دەستەکانی دەلەرزین، ڕەنگی تێکچووبوو، گەر بیزانیبایە ئەم دیمەنە دڵتەزێنەی تووشی خۆی نەدەکرد بەڵێنی پێنەدەدا.دوو ڕۆژ لای بڵند مانەوە، شنرویێ زۆر هۆگری باوکی بوو، حەزی بە نیان نەدەکرد، بەو منداڵییەی دەیزانی وهەستی دەکرد نیان لە باوەشی دایکی ڕفاندووە.
بە دایەنگەی نزیکیماڵەکەی خۆی سپارد، زۆر سەردانیی دەکردن، دایەنی لێهاتوی لێبوو بۆ خزمەتی منداڵان، جێخەوی، جێیاری، جێخواردنی وجێمیوزیکی تایبەت بە منداڵان، ببوونە جێسەرسوڕمانی بڵند و ڕاهاتنی شنرویێ.........

## (١٥)

## پاش پازدەساڵ

شنرویێی هەرزەکار، ژیر و زیرەکی قوتابخانەکەی بوو، زمانی دایك بە تەواوی فێرببوو، چونکە لەماڵەوە بە کوردی لەگەڵیدا قسەی دەکرد، جگە لەوەش تا ئەو تەمەنەی، دوازدە جار، هەرجاری مانگودوومانگ لەبەر دایە چرۆی بردبوویەوە، شارەزایی تەواوی لە شار هەبوو، تەنانەت زۆریش بۆ ماڵی ئازاد لە سنە وچالاك لە مهاباد دەچوون، پاشان لە دواجاری چوونیان کاتی ئەوەی هاتبوو باسی کیمیابارانی شار وباسی دایکی ڕاستەقینە ونەنك وباپیری بۆ بکات، گۆڕی دایکی ڕاز ونەنك وباپیری پێشانبدات.هەمیشە پێیدەگوت دایە چرۆت دەبێت زۆر خۆشبوویێت وهێندەی دایە ڕازت، نابێ مرۆڤ بێوەفا بێت.جگە لەوەش باسی نەنك وباپیری بۆ دەکرد، پیرۆزی باپیریی بۆ باسکرد وێڕای ئەوەی باری دەروونی خراپبوو وبە شێت لە قەڵەم دەدرا، بەلاّم لە ڕۆژی بە خاکسپاردنی بازاڕی شار چۆڵببوو، هەموو بە دووی باپیرتەوە بوون.گۆڕەکەیت بینی چیی خزمەتکراوە، ئەوە خەڵکی کردوویەتی وهێند باوەڕیان پێیەتی ئەوانەی باری

دەروونیان خراپبێت دەچنە سەر گۆڕەکەی تا کەمێ لە ئاڵۆزی باری دەروونیان سوك بکرێ.

دیارە تاقییان کردووەتەوە بۆ ئەو چارەسەرەیان.

– باوکە دەبێ منیش بچمە کۆلێژی پزیشکی دەروونی کلینیکێ لە شارەکەمان دابنێم، تا بتوانم وەك باپیرم نەخۆشە دەروونییەکان ئارام بکەمەوە.

بڵند زۆری پێخۆشبوو پێش مردنی ڕاسپاردەکەی بە ئەنجام بگەیەنێ.کوڕی باوکی خۆیبوو، چووە کۆلێژی پزیشکی بەشی تایبەت بە دەمارو دەروون.

## (١٦)

## پاش (بیستوپێنج ساڵ)

له ساڵوەگەڕی کیمیاباران، خەڵکانیٚ زۆر له مرۆڤدۆستانی جیهان ڕوویان لەو پارێزگایه کردبوو، له هەموو پارێزگاکانی دیکەی کوردستان پیرۆزتر سەیر دەکرا، ناوی لێنرابوو شاری پیرۆز، هێند کارەساتەکه جەرگبڕ و نا مرۆڤانەبوو، جینۆسایدبوونی کوردی به جیهان ناساند و سەلماند.

لەو ڕۆژەوەی ببوو به پارێزگا، خزمەتی زیاتریان بۆ دەکرد، به کۆشکوتەلاری بەرز، شەقامی پانوبەرین وخاوێن، پارکێکی زۆر گەورە، به ناوی (پارکی پیرۆز)، پێنج هەزار نەمامی لێڕوێنرابوو، چوار وەرز به سەوزی دەمانەوە، هەریەکەیان ببووە دارێکی زۆر بەرز وهەمیشه سەوز و گەش، دیمەنی شاری پیرۆزی ڕازاوەتر کرد بوو، خەڵکی شار زۆر ڕێزیان لەو پارکه دەگرت، هەر دارێکیان به زیندووبونەوەی شەهیدیٚ دەچوان، چەندین نەخۆشخانەی تایبەت دروستکرابوو، به ناوبانگترین وگەورەترین نەخۆشخانه نزیکی پارکی پیرۆز دروستکرابوو، چەندین ئامێری پێشکەوتووی جیهانی بۆ جۆرین نەخۆشی ئەو شاره پیرۆزه تەرخان کرابوو، چەندین ئوتێلی نایاب بۆ میوانانی جیهان دروست کرابوو،

دەزگایێ تایبەت بە ژینگە پارێزی سەرپەرشتی ژینگەی شاری پیرۆزی دەکرد، تا بتوانن ڕازاوەیی شار، توانای خەڵکی شار بە جیهان ئاشنابکەن، بناغەی فڕۆکەخانەیان دانابوو، لە نزیك تەواو بووندابوو.

خوێندنی شنرویێ نەبوایە لە مێژ بوو بڵند وەك ئەو کوردانەی هاتبوونەوە باوەشی گەرمی نیشتیمان و وازیان لە باوەشی غوربەتی هێنابوو، دەگەڕایەوە.بڵند دەیوت کوڕەکەم زۆرت نەماوە، هەر خوێندنت تەواوبوو بڕوانامەکەت وەرگرت، دەچینەوە شارەکەی خۆمان، کلینیکی خۆت دابنێ، ئاگات لێیە شارەکەمان ئێستە شان لە شانی خۆشترین شاری جیهان دەدات.

تەمەنێکی زۆری بەسەربرد، نەخۆشی وئازار هەراسانی کردبوو، بەلاّم هەموو تەمەن و هەوڵدانەکانی ژیانی لەم ڕۆژە پیرۆزەدا دەبینییەوە کە شنرویێ، ئەوڕۆ، بەڵێ هەر ئیمڕۆ لە ئاهەنگێکی تایبەت بە دەرچوانی کۆلێژەکەی بڕوانامە وەردەگرێت، لەوەش خۆشتر لە یەکەمەکانی کۆلێژەکەیەتی لە تایبەمەندیی (بواری دەمارو دەروون)، خۆزگەی دەخواست ڕاز بمایە ولەم ئاهەنگە بەشدار بووایە، وێڕای ناتەندروستی، بەلاّم ئەو ڕۆژە خۆی لە ئازارە بەتینەکانیش گێل دەکرد.

دەنگی زەنگی تێلەفۆنەکەی گویێ لێبوو، شنرویێ بوو، دەیگوت باوکە گەر تەندروستیت باش نییە دەتوانی نەیەیت، دوایی لە سیدیەکدا تۆمارکراوی ئاهەنگەکەت بۆ دێنمەوە، ئەو گوتی

کوڕەکـەم، خۆشەویسـتیم بۆ ژیـان لـە پێنـاو بینـینی ئـەم ڕۆژەیـە، (دەمبینی ئیمڕۆ لە ئاهەنگەکەت چۆن گەنجێتی بووەتەوە میوانی باوکت).زۆر دڵخۆشبوو بەوەی بەشداری لە ئاهەنگەکەی دەکات، پـاش تـەواوبوون لـە تێلیفـۆن، لەبەرخۆیـەوە دەیـوت بەرانبـەر ئازارەکان کڕنۆش نابەم، نەوەکو مەرگ زەفەرم پێبەرێ، پاش ئەم ڕۆژە چیی دەبێت با ببێ، با مەرگ ئازا بێ و بمگاتێ، من نەچم کێ دەچێت، کێی هەیە لەم وڵاتە غوربەتە، تەنیا منم گشت کەسەکەی، ( ڕاز گیـان خۆزگـە لـە ژیانـدا دەبوویـت وئێسـتە پێکـەوە قۆڵمـان لێکدەناو دەچووین بۆ ئەم ئاهەنگە).ئاهێکی لە ناخەوە هەڵکێشا، کـاری لـە مێشـکە توشـبووەکەی کـرد وهێنـدە نـەبوو دیسـانەوە سەرسوڕانەکەی تووشبێتەوە.

بە پەلە چوو ڕیشی زۆر بە جوانی تاشی و سەروچاوی شۆری، ماوەیەك بوو بە لای کەنتۆری قاتەکانی نەچوو بوو، تەماشایکردن، وەك ئەوەی چووبێتە پێشانگەی جلوبەرگەوە، تازە ئاشنا دەبێت بەو قاتانـەو نـازانێ کامیـان هەڵبـژێرێ، لـە پـڕ دەسـتی بـۆ قاتـە قاوەییەکـەی بـرد ولەبەرخۆیـەوە گـوتی، ڕاز زۆر حـەزی بـە ڕەنگـی قـاوەیی بـوو، لـە تـاران پیشـئەوەی پێشچـاوم ڕونبێتـەوە چووینە بازێڕ وقاتێکی قاوەیی بۆ کڕیم، تەنانـەت لە ڕۆژی کیمیابارانەکە، قـاتێکی مـەرەزی قـاوەیی وکڵاشـێکی پـەڕۆین ولـە ژێـر قاتەکـەم کراسێکی ڕەشم لەبەر کردبوو، بینیمی گوتی (دەمەوێ هەمیشە ئەم جۆرە ڕەنگە لەبەربکەیت، هێند سەرنجیدام، فرمێسك لە چاوە

گەشەکانی قەتیس مابوو، پاشان خۆی بۆ نەگیرا، فرمێسکەکانی هاتە خوارەوە، کە گوتم بۆ دەگری؟خەونی ئەو شەوەی بۆ گێڕامەوەو دڵی زۆر دەترسا شتێکمان لێبێت کە بە ڕاستی خەونەکەی هاتە دی).هەربۆیە دەبێت ئەوڕۆ بە زەوقی ڕاز بکەم.لە دوودڵی هەڵبژاردنی لەبەرکردنی کام قات، ڕزگاری بوو، بە پەلە خۆی گۆڕی، بۆنپرژێنی خۆیکرد وچووە بەر ئاوێنەکە، زۆر نزیك کەوتەوە لە ئاوێنەکە، پێدەچوو لە مێژبووبێ یەکیان نەدیبێ، زۆر تەماشای خۆیکرد ولە خۆی وردەبووەوە، (خۆی لە نێو پریاسکەیەکی گرێدراو، چەندین یادەوەریی تیا حەشاردرابێ، بە ئاسپایی گرێکانی دەکردەوە، لاوێتی، ئەڤینداری، ناخۆشییەکانی ژیانی لە خۆگرتبوو، هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ئەو ئەلبوومە پیرۆزە، ئاوازی میوزیکێ بوو بۆ زاخاوی مێشك وئازارەکانی ڕادەماڵی، ڕوخساری لاوێتییان پێدەبەخشی، زۆر تەماشای کرد، سەرنجی خۆیدا، لە پڕ زەردەخەنەیەکی بێوێنە ڕایچڵەکاند، نەگۆڕابوو، دەیویست ئاوڕبداتەوە، توند بیگوشێتە خۆی ولەگەڵ خۆی بۆ ئاهەنگەکە بیبات، بەڵام چەندی دەکرد ئاوڕی پێنەدرایەوە، هێزێك لەو شوێنە چەقاندبووی، چاوی خۆی هەڵگلۆف وپاشان کردیەوە وسەرنجی تەواوی ئاوێنەکەیدا تا بزانێ ئەوەی دەیبینێ ڕاستە، بۆی دەرکەوت ڕازەو لە پشتییەوە وەستاوە، پرسیاری کرد، ڕاز گیان تۆی؟!قوربانت بم، لە مێژە ونی تەنانەت نایەیتە نێو خەونەکانیشمەوە، ئەوڕۆ ئاهەنگی شنرویێ یە. دەزانی؟!

بـه دەنگـه ناسـکەکەی جـارانی، ڕوخسـارێکی گەشـی لاوێـتی، تەزوویـەکی بـەتینی بـه جەسـتەیا تێپەڕانـد.( بڵنـد گیـان هیـوای هەردووکمان شنرویّ یە، پەلەکە وبگەرە ئاهەنگەکەی، منیش لەویّ چاوەڕوانم)، ویستی ئەمجارە ئاوڕبداتەوە تا پێکەوە بڕۆن، لەگەڵ ئاوڕدانەوەی لە پێشچاوی ونبوو.

شـنەبایێ بـۆنی سـێوی لـە حۆگرتبـوو، بـە لووتیـا هـات، هێنـد هەناسـەی خۆشـکرد، کۆسـپی نەهێشـت لـە ڕێـی هەناسـەکەی.زۆر پەشیمانبوو، دەیگوت بۆ وامکرد، دیسانەوە تەماشای ئاوێنەکـەی کردەوە، بە وردی دەیڕوانی، بەو نیازەی بیبینێتـەوە، بێسوودبوو، دەنگـی زەنگـی تێلێفۆنەکـە ڕایچڵەکاند وبـە ئاگـای هێنایـەوە، بـە ئاوڕدانەوە لـە ئاوێنەکە بەرەو تێلێفۆنەکە چوو، هەڵیگرت، کـەس نـەبوو، زۆر گـوتی ئـەلوو، ئـەلوو، هـەمان ژمـارەبوو کـە شـنرویّ تێلێفـۆنی پێکـرد بـوو، بـەڵام سەریسـوڕما بۆچیـی شـنرویّ وەڵامـی باوکی نەدایەوەو بە ئاسپایی دایخست، لەگەڵ داخستن هەمان بۆن لـە تێلێفۆنەکـەوە بـەرلووتی کەوتـەوە، دڵـی زۆر ترسـا لـە شـنرویّ، هـەر بۆیـە پەلـەی ڕۆیشـتنی بـوو، سەریشـی لـەو بـۆن سـێوە سوڕمابوو.

شنرویّ لەگـەڵ هاوڕێکـانی لـە پێشـوازی کەسـوکاریانبوون، وتـی: کوڕەکەم بۆ تێلێفۆنت کرد وداتخست؟

- باوکە تێلێفۆنم نەکردووە.

- ئەی هاوڕێکانت؟

- ئـەوانیش نـەیانکردووە، چـونکە هیچـمان بـە هـۆی پێشـوازی میوانان دوور ناکەوینەوە.

لە دڵی خۆیدا وتی دڵنیام بۆنەکە بۆنی ڕازە، تێلێفۆنەکەش هەر ڕاز کردوویـەتی.لەسەرکورسـییەکی ڕیـزی پێشـەوەی هۆڵەکـە بـاوکی دانیشـــاند، یارمـــەتی لێـــوەرگرت دەخولـــەکێ دیکـــە بـــۆ لای دەگەڕێتـەوە. شـنرویٚ زۆر دڵخۆشـبوو، دڵخۆشـییەکەی ختوکـەی خۆشی بە باوکی بەخشیبوو، هەمیشە بە زەردەخەنەوە دەیڕوانییە خەڵکی، یا هاوڕێکانی شنرویٚ.

بۆنی سێو دیسانەوە بە لووتیا هات، بە پەلە تەماشای چواردەوری خۆیکرد، دەیگوت وابێت ڕاز لێرەیە، بەڵام هیچی نەبینی.

شـنرویٚ هاتـەوەو لـە تەنیشت باوکی دانیشت، گوتی باوکە بۆنی سـێوت لێـدیٚ، گـوتی ڕاسـت دەکـەی، گـوتی باوکـە ئـەوڕۆ بـەڵێنی خۆت بە جێهێنا، بەڕاستی گەنجی.

زەردەخەنەیەکی بۆی کرد ودوو ماچیکرد، لەو کاتەدا هۆڵ بە هۆی پێـدانی ئاگـاداری لـە بڵندگۆکـەوە، بـۆ گوێڕایـەڵی لـە لیسـتی نـاوە یەکەمـەکانی کۆلێـژ، هەراوبـەزمی نێـو هۆڵەکـەی کپکـرد.نـاوی شـنرویٚ بڵنـد خوێنرایـەوە بـۆ وەرگـرتنی بڕوانامەکـەی.لەگـەڵ هەسـتانی شـنرویٚ بـۆ وەرگـرتنی بڕوانەمـەو ڕێزلێنـان، بـاوکی بـە چـەپڵەوە لەبـەری هەسـتا، ئـەمجارەیان بینیـی، بە تاقە چاوەکەی بینی، وا دەستی لە نێو دەستی شنرویٚ ناوە، بەرەو سەکۆی شانۆ هەنگاو دەنێت، کە بڕوانامەکەیان بە شنرویٚ بەخشی، ئەویش وەك

پێشکەشکارەکە باوەشی لە شنرۆیدا، لە خۆشیان نەیدەزانی چیی بکات، لەگەڵ شنروێ دەستی بەرزکردبۆوە بۆ بڵندی ڕادەوەشاند، بالآکەی وەك جاران بەرز وکەمەرێکی تەنگ وکراسێکی سپی شۆڕی ئاوریشمی ناسك زۆر نەرم، زۆر جیاواز لەگەڵ کراسی ئافرەتەکانی ئاهەنگەکە، ویستی هەستێ وبگاتە لای هەردووکیان، هەرکە هەستا، ڕاز ونبوو، بڕیاریدا گەر خۆی پێشانبداتەوە ئەمجارە هەوڵی نزیکبوونەوەی نەدات.

ئاهەنگ دەستیپێکرد، تەماشای سەماو دەنسی شنروێ و هاوڕێکانی دەکرد، لە پڕ ڕازی بینییەوە، لە هەموو سەماکەرەکان جوانتر، ناسك و بالآ بەرزتر، هێند دڵخۆشبوو دەمی یەکی نەدەگرتەوە لە پێکەنین وخەندەی، بەرانبەری (شنروێ)ی گرتبوو وسەمای جوانی بۆ دەکرد.دەیویست بچێ بەلآم دەترسا لەوەی دیسانەوە ونبێ، ڕاز دەستی بەرزکردەوە وهێمایکرد تا بڵند بڕواتە نێو سەماکەرانەوە، ئەمیش زۆر حەزیدەکرد، تا بە تەواوی نزیك نەبووەوە لە بەرچاوی وننەبوو، چووە ناوجەرگەی سەماکەرانەوە، شنەبایەك، کەس نەیدەزانی لە کوێوە دێت، بۆنی سێو لە هەموو بۆنەکانی دیکە بە تینتر، خۆشتربوو، هەستت بە خۆشحاڵی و مەستی سەماکەران دەکرد وهەمووی سەری ڕێزیان بۆ باوکی شنروێ دەنواند کە بۆنێکی تایبەت لە سێوی پرژاندە نێو سەماکەرانەوە.لەبەردڵی شنروێ کەمێ سەمای کرد، بەلآم شنروێ هۆشوبیری لای باوکی بوو، دەترسا لەوەی نەوەکو سەرسوڕانەکەی

تووشبێتەوە، چرپاندییە بنگوێی شنرویّ وگوتی کوڕەکەم دەزانی دایە ڕازت لەگەڵدایەو لەوساوە سەمات لەگەڵ دەکات؟! وتی(باوکە گیان دەزانم زۆر دڵخۆشی، لەم ڕۆژەدا زیاتر بیری دایکم دەکەیتەوە، هەربۆیە وا دەزانی).دەستی خستە نێو دەستی باوکییەوە وچوونەوە شوێنی خۆیان دانیشتن، گوتی باوکە گەر تەندروستیت باش نییە، دەڕۆینەوە.

– مەترسە زۆر باشم و ئەوڕۆ گەنج بوومەتەوە، دڵنیام لەو قسەیەی پێمگوتی (دایکت لەگەڵماندایە)، کاتی بڕوانامە وەرگرتنەکەت وکاتی سەما کردنەکەت خۆی بۆ من ئاشکرا کرد، هەر ئەویش بانگی کردم بۆ نێو سەماکەران، شنەبایەك وبۆنی سێو، جوانترین نیشانەی بوونی دایکتە لە نزیکەوە، بە هاتنی من دایە ڕازت دوورکەوتەوە، بۆنی سێوەکەی بۆ جێهێشتین، ئەی نەتبینی سەماکاران وایاندەزانی منم بۆن سێوم لێدیّ وهەموو سەریان دائەنواند لە ئاستی من.

– (باوکە گیان دڵنیابە تەنیا خۆشەویستیی و وەفاییتە بۆ دایە ڕازم).

تەماشایەکی شنروێی کرد وماچێکی کرد وگوتی وا نەزانی بویتە بە دکتۆری دەروونی، من زۆرباشم، دڵنیابە ئەمەی دەیڵێم ڕاستییە. لە پڕ بۆنیّ بە لووتیانا هات، بڵند گوتی بۆن ئەکەی؟

– بۆن ئەکەم، تەماشای سەر ئەو مێزانەی کرد بۆ ئاهەنگەکە ڕازابۆوە ، چەندین جۆر میوەیان لەسەر بوو، بەلاّم سێوی لەسەر

نەبوو، ئاوڕی لە باوکی دایەوە، شنرویٚ کەمیٚ سەریسوڕما، بەلاٚم نەیهیٚنایە سەرخۆی.

– تا ئەم بۆنی سیٚوە بە لووتما بیٚت، لە ئاهەنگەکە بیٚزارنابم، تۆ بڕۆ بۆ لای هاوڕیٚکانت، لەو کاتە باوکی هاوڕیٚیەکی هات بۆ پیرۆزبایی، یەکسەر بە باوکی ناساند وئەو ڕۆیشت بۆ لای هاوڕیٚکانی، ئەمیش هاوڕیٚی تازەی پەیداکرد وکەوتنە دەمەتەقیٚ، بەلاٚم هەمیشە (بیروهۆشی لای شنرویٚ وبۆنکردنی سیٚو بوو).لە پڕ بۆنەکە هاتەوە، بۆ دلٚنیایی خۆی بە هاوڕیٚکەی گوت، دەزانی بۆن سیٚویٚ خۆشدیٚ؟

– زۆر ڕاستە! بەڕاستی ئەم بۆنە میٚشك دەکاتەوە.

دلٚنیابوو ڕازە و دەوروخولیئەدا.لە دلٚی خۆیدا گوتی، (بلٚیٚی تەنیا بۆ ئاهەنگەکە هاتبیٚ، یا مەرگ لیٚم نزیکبووەتەوە، ڕاز دەیەویٚ بمبات لەگەلٚ خۆی نەوەکو یەکیٚکی دیکە داگیرم بکات، پیٚدەچیٚ شویٚنی بۆ گرتبم، یا لە میٚژە شویٚنی گرتووە لە چاوەڕوانی مندایە!!).

گەڕانەوە مالٚ، لەبەر ماندووبوون، شنرویٚ چووە ژووری خۆی، بەلاٚم لە پڕ گەڕایەوە بۆ ژووری باوکی، باوکە گیان خەریکە منیش دیٚمە ئەو بڕوایەی دایەم ڕاز لیٚمانەوە نزیکە، باوکە گیان بۆنی سیٚو ژوورەکەی داگیرکردووم، وەك بۆنی سیٚوی ئاسایی نییە، هەناسە سووکوخۆش دەکات، ئارامی بە دلٚ و دەروون دەدات.

بلٚند :ناترسی؟ گەر دەترسی دیٚمە لات ئەنووم.

- باوکە گیان ئەو بۆنە چیی ترس هەیە ڕایدەماڵێ، ترسی چیی؟!!
پێشئەوەی بڕوات گوتی کوڕەکەم شتێك زۆر لە مێژە لە دڵمدا پەنگ دەخواتەوەو لەبەر ئەوەش چەندین ساڵە لە دڵما هەڵمگرتووە تا قۆناغی خوێندن بە ئارامی تەواو بکەی، پاشان پێتبڵێم.
- باوکە گیان حەزناکەم هیچ شتێ لە دڵی خۆت بێڵی.
- دەکەواتە تۆ دانیشە با بچم دوو قاوەی خۆش بۆ هەردووکمان بکەم وماندووبوونت بحەسێتەوە، ئەوسا دەمەتەقێی خۆشدەکەین.
- باوکە با من بچم، تۆ ئیمڕۆ زۆر ماندووبوویت.
- بە پێچەوانەوە کوڕم، لە ژیانما وەکو ئەوڕۆ خۆشبەختودڵخۆش نەبوومە لەبەرئەوە بە یارمەتیت چاوەڕوانبە.
لەگەڵ یەکەم فڕلێدانی قاوەکە وتی باوکە گیان بە ڕاستی قاوەیەکی خۆشت کردووە، ڕێك دەڵێی بۆ حەسانەوەی ماندووێتی کردووتە.
- سوپاس کوڕەکەم.
- باوکە هەر بیرم لای قسەکەی نێو دڵتە.با لە دڵە خنجیلەکەت نەبێتە گرێ.
- دەمەوێ چیمگوت، شەرم نەکەیت وڕاستیم لێنەشاریتەوە.
- فەرموو باوکە بە دڵنیاییەوە، .
بڵند دوا فڕی لە قاوەکەیدا وتی:
کوڕەکەم حەزدەکەم ئەوەی پێتی دەڵێم وەك ئامۆژگاری و ڕاسپاردەیەك لێموەرگری، من تەمەنێکم بردووەتە سەر، دونیام دیووە، جا دەمەوێ باسی ئەو کاتانەت بۆ بکەم بە ئێراندا

دەچووینەوە بۆ شارەکەمان، لە ئێران هەمیشە سەردانی ماڵی (ئارام)ی جوانەمەرگ ومالْ (چالاك مهابادی)مان دەکرد، لەگەڵ ناوهێنانی (چالاك مهابادی) ڕوخساری شنرویْ سوور هەڵگەڕا، هەستیکرد باوکی بەو تەزووە ناکاوەی زانی، بە کەمە شپرزەییەکەوە گوتی ڕاستە. . باوکەگیان. باوکی بۆ ئەوەی زیاتر بۆی ڕوون بێتەوە تا چەندیْ تەزووی ئیشق کوڕەکەی دەبزوێنیْ، ئەمجارەیان گوتی(چالاك مهابادی)، واتە ماڵی (کاڵیْ). ئەمجارە شەرم سەری پێداخست، باوکی بە دەنگیْ کەمیْ بەرزتر تا کوڕەکەی تەماشای بکات و هەردووچاوی گەشی ببینیْ، شنرویْ چاوی هەڵبڕی(چاوە لە دەستچووەکانی خۆی هاتەوە یاد کە لەگەڵ بینینی یا ناوهێنانی ڕاز، چاوەکانی دەبوونە چاوێکی ئاوی بریسکەدار و دەدرەوشانەوە)، کوڕەکەم ئەوەی من لە تۆو کاڵیْ دەمبینی لە دوو خۆشەویست دەچوون، لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی کاڵی بۆ چا هێنان یا میوە هێنان، سەرنجێکی ئاشقانەت دەدا، ڕەنگ وڕوخسارت سوور هەڵدەگەڕان ونێوچەوانت لەبەر ئارەق کردنەوەی بریقەی دەهات، ئەویش بە هەمان شێوە سەری لێدەشێوا ولە دابەشکردنی چایەکەدا دەستی دەلەرزی، لە قسەکردندا وشەکانی ناسکوپچڕ پچڕ دەردەبڕی.بەردەوامبوو و وتی نامەویْ شەرم بکەیت، گەر خۆشەویستی کاڵیْ لە دڵتدایە، ئەوا گومانی تێدا نییە دەبێت بیگەیتیْ، گەرنا، ئەوا تا لە ژیاندا بیت، خۆشی نابینی.

به زەردەخەنەیەکی پڕ لە شەرم، پڕ لە خۆشەویستی بۆ باوکێکی زیرەکوبەهەست، گوتی، باوکە گیان ناتوانم هیچت لێبشارمەوە، لەگەڵ کاڵێ زۆر یەکترمان خۆشدەوێت، بڕیارمانداوە هاوسەرگیری بکەین، بەلأم باوکە ئەو ساڵێکی دیکە دەبێت بە مامۆستا، من لە چاوەڕوانیدا دەبم تا تەواو دەبێت ئەوسا بە باوکی بەڕێزم دەڵێم بچێت بۆ خوازبێنی.

– کوڕەکەم دەمەوێ لەم ڕۆژانە بگەڕێینەوە تا لەگەڵ باوە کاوە ودایە چرۆت بچینە خوازبێنی، تا تۆ کلینیك لە شار دادەنێیت وخۆت ئامادە دەکەیت، ئەویش تەواو دەبێت، کوڕەکەم توخوا پەلەبکە نەوەکو مەرگ ڕێم نەدات ببم بە باپیرە. دەترسم زۆر دەترسم لافاوێ بێتو ئەو حەزەتان لێتێکبدات، دڵنیابە، تەنیا یەکەمین خۆشەویست دەمێنێ ونامرێ، (خۆشەویستی وئیشقی یەکەمینجار نەمامێکەو لە نێو دڵدا دەڕوێ ورەگ دادەکوتێ، دڵیش تەنیا یەك نەمامی تێدا شین دەبێت ونابێت بە دوو. ئەو نەمامە بە فرمێسك ئاودەدرێت، بە گڕی ئیشق دەگەشێتەوە، ئەو گڕەی لە خوێندایە، لە هەناسە، لە هەموو شوێنێکی جەستە خۆی حەشارداوە) ئەو نەمامە فەرامۆش مەکە، چونکە بە هیچ هەناسەیەکی دیکە گەشنابێتەوە.

دوو تنۆك لە فرمێسکی گەشی شنروێ دڵی بڵندی داچڵەکاند وگوتی لە سبەینێ زوتر نییە دەبێت پسوڵەی چوونەوە بۆ نیشتمان ببڕیت ، دەمەوێت پێش مردنم ئاهەنگی تۆ وکاڵێ ببینم.

باوەشیان لێکدا، باوکوکوڕێکی ئاشق، تێگەیشتوو لە ئیشق، دەیانزانی بۆچی دەگرین، لە یەکتر نەدەبوونەوە، بەلاّم دیسانەوە بۆنی سێویکی زۆرخۆش، دڵخۆشیکردن، زانیان ڕازەو ئاگاداری گفتوگۆکەیان بووە، ئەمجارەیان شنرویّ گوتی باوکە گیان دایە (ڕان)مە!! تەماشای چواردەوری خۆیان دەکرد، بەلاّم هیچیان نەبینی، بڵند گوتی چونکە هەر لە یەکەم بینینەوە، نەمامی خۆشەویستی وئیشقمان لە دلاّ ڕوان وبە هەناسەی گەرم وخوێنی ئالّودە بە ئیشقێکی پاکوبێگەرد نەمامەکەمان دەگەشانەوە، ئەوا خۆت دەبینی ئەو لە دونیایەکی دیکەیە، بەلاّم واز لە خۆشەویستیمان ناهێنیّ.

– باوکە گیان شانازیت پێوەدەکەم، زۆر دڵخۆشم کەسێکی وەکو تۆ باوکمە.

– کوڕەکەم ماندووم کردی، دەمەویّ بچیت بنوی ، بەلاّم پێشئەوەی بڕۆی دوا ڕاسپاردەت پێدەڵێم، ئەویش ئەوەیە(گەر مەرگ ڕێی پێنەدام، دەمەویّ کالّیّ بێنی)، گەر لەبەر دابونەریت نەبێت هەر ئێستە بە تێلێفۆن خوازبێنی کالّیّ دەکەم.کاتەکە درەنگە با بیکەینە شەو.

– بە شەرمەوە گوتی باوکە داوای لێبوردندەکەم، زۆر شەوانە درەنگ پێکەوە قسەمان کردووە، دڵنیام ئێستە لە چاوەڕوانییە، بە تایبەت دەزانیّ ئەوڕۆ ئاهەنگی دەرچوونم بوو.

بڵنـد بـه بزەیەکـەوە گـوتی، بـوراوی، چـونکە زۆر ئاسـودەتکردم. دەفەرموو قسەی لەگەڵ بکە.

لەگەڵ یەکەم زەنگ لێدان هەڵیگرت وبە دەنگێکی ناسك، هێنـدەی دڵی تازە پێگەیشتوی ئیشقێتی ناسك، (گیانەکەم شنرویێ خۆتی، زۆر لە مێژە چاوەڕوانی پەیوەندییت بووم، پیرۆزباییت لێدەکەم دکتۆر شنرویێ).

– سوپاس مامۆستا گیان.

– هێشتا نەبووم بە مامۆستا، ساڵێکم ماوە.

– دەتوانم پێش ئەو ساڵە بێم بۆ خوازبێنیت؟

– تۆ خۆشەویستی منی، یا بۆ تـۆ دەبم یا بۆ گڵ.جا هـەر کاتێ بێیت ئاساییە

– کەواتـە دەتـوانم لـەم ڕۆژانـە بێینـەوەو بـاوکم خوازبێنیـت بکـات. دەنگی گۆڕا، پـاکی فرمێسـك و گرینێکـی هـێمن، وشـە ناسـکەکانی لێك دەترازاند، لە خۆشیان نەیدەزانی چیی بڵێت تـەنیا ئەوەنـدەی دەگوت خۆشم. . دەوێی، لە ناخی. . دڵا هەڵمگرتووی، دەبێت ئـەو ڕۆژە بێـت وبـەرگی بـوکێنی لەبەربکـەم وقـۆڵم لـە نێـو قۆڵتـدا بێـت وپێکەوە هاوسەرگیری بکـەین، ئاخۆ دەبێـت کـەی ئـەو ڕۆژە بێت؟! شنرویێ دەیویست خۆگر بێت، بە هـێمنی دەیگـوت، کاڵێ گیـان بۆ دەگری، خـۆمن هـەر بێمـەوە، دێینـە خـوازبێنی وباوکم بڕیاریـداوە، بەڵام دەڵێت نابێت بە تێلیێفۆن لەگەڵ باوکی قسە بکەم.

– کەواتە باوکت تێگەیاند؟

– باوکم هەر لەیەکەمین ڕۆژەوە خۆی دەیزانی، بەڵام ئەمشەو پێیگوتم.
– دەستی باوکت ماچدەکەم. سڵاوم بگەیەنە.
– مەگری کاڵێ گیان، بۆ فرمێسك دەڕێژی؟
– نازانم، خۆمیش نازانم.
– توخوا مەگری، گیانەکەمی، پێبکەنە تا ئەوسا بڵێم بە خوات دەسپێرم و شەوت شاد.
دڵی نەشکاند، بە پێکەنینێ تێکەڵ بە گریان وتی شەوت شاد دکتۆر شنروێ گیان.
(خەیاڵ بۆ خۆی ڕاپێچی کردبوو لەگەڵیدا فرمێسکی دەڕشت)
شنروێ بەو شێوەیە باوکی بینی، بە پەلە خۆی گەیاندێ وگوتی باوکە گیان، بمزانیبا قسەم لەگەڵ کاڵێ نەدەکرد، هێند گریان قوڕگی گرتبوو، بە دەستی هێمای، ئاساییە. ئاسییەی بۆ شنروێ کرد، ئێستێك بێدەنگی دایگرتن، دەستی خستە سەرشانی باوکی وگوتی باوکە دڵت ناشکێنم، هەر سبەینێ پسوڵەی فڕۆکە دەبڕم.
باوەشی بۆ کردەوە، تێر گوشییە خۆی وپاشان دوو ماچیکرد وگوتی گەر مەرگیش مەودای نەدام، ڕاسپاردەکەم ئەنجامدە.
ماچی باوکی کرد و گوتی باوکە گیان تۆ وا مەڵێ خوا تەمەنی منیش بخاتە سەر تەمەنی تۆ، خۆت گوێت لە هەموو شتبوو، لەوانەیە دایە ڕازیش ئاگادارمان بووبێ، بەڵام دەترسم ئەو لە

سوچێکدا بگری ولەبەرگریان لێمان نزیکنەبووبێتەوە، پاشان بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی، وانیە باوە بڵند؟!

- دوور نییە کوڕەکەم.دوور نییە.تۆ بڕۆ شەوت شاد.

زۆر تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد وسەریسوڕما لەم سەرگوزشتەیە، ڕاز دیارنەبوو.لە پڕ لەسەر کورسییەکی لای تێلیێفۆنەکەوە ڕاز دانیشتبوو، فرمێسکی دەڕشت. پێیگوت ڕاز گیان بۆ دەگری؟!

- بۆ خۆم وخۆت، شنرویێ وکاڵێ.

- ڕاز گیان توخوا مەگری دڵم ئازار مەدە.

- لەبەر تۆ هەمیشە لە ئازارام، تۆ دەبینم هەمیشە دڵتەنگ، بە ژەنینی عودەکەت ئاوازەکانی هەردوکمان لێدەدەیت ودڵی خۆت و خۆم ئارامدەکەیتەوە، ئەوسا پەرۆشترت دەبم وحەزدەکەم بە زووترین کات بگەینە یەکتر، بەڵام ڕێم پێنادرێ چیببکەم مەرگ نەیهێشت ماوەیەکی درێژتر پێکەوەبین.

- هەستدەکەم پێکگەیشتنمان زۆر نزیکە، هاتنت بۆ لام زیاتر ئەوە دەسەلمێنێ مەرگ هێدی هێدی وا خۆی پێمدەگەیەنێ، توخوا ڕاستم پێبڵێ ڕاز گیان وایە یا نا؟!

بە زەردەخەنەیەکی جوانەوە تەماشایکرد ولە پێشچاوی ونبوو.

ئەو شەوە زۆر لە چاوەڕوانیدا بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی مەرگ نزیکمە، نەوەکو مەرگ ڕێم پێنەدا با تێلیێفۆن بۆ کاوە بکەم، وێڕای

درەنگی شەو، بەڵام هێزێك سوورتریكرد لە پێوەندییەكە ودەستی بۆ تێلێفۆنەكە برد وكاوەی وەرگرت.
كاوە: پیرۆزباییت لێدەكەم دەمانویست پێوەندیی بكەین، بەڵام شنرویێ لە خۆشییان دووجار لە ئاهەنگەكەوە پێوەندیی كرد، دایە چرۆی سبەینێ خێری بۆ دەكات تا خوا پارێزراوی بكات.
– دەزانم ئێوە هێندەی من و ڕاز پەرۆشی دوا ڕۆژی (شنرویێ)ن، بەڵام كاوە گیان بەم نیوەشەوە بۆیە تێلێفۆنت بۆ دەكەم، ڕاسپاردەیەك هەیە دەمەوێ پێتی بڵێم، نەوەكو بە یەكجاری ماڵاواییتان لێبكەم.
– توخوا شتی وامەڵێ، من وچرۆ لە چاوەڕوانی ئێوەین، تا ئەو تەمەنەی ماوە پێكەوە بە یادی جارانەوە بیبەینەسەر، ئێمە لەوساوەی شنرویێ پێیگوتووین كلینیك لای خۆمان دەكاتەوە بۆ خزمەتی شارەكەمان، زۆر دڵخۆشین ودەمانەوێ ڕۆژێك زووتر بگەڕێنەوە.
– منیش خۆزگە بۆ ئەو ڕۆژە دەخوازم لەگەڵ ئێوە بژین، بەڵام كاوە گیان نەخۆشییەكەم تا دێت ئازارم زیاتر دەدات، لە نەخۆشییە كوشندەكانە، ئیدی نازانم چەندێ دێڵێ لە ژیان بەردەوامبم، هەر بۆیە دەڵێم گەر مەرگ مەودای نەدام، دەمەوێ لەبری من(بچیت خوازبێنی (كاڵێ)ی (چالاك مهابادی) بكەیت بۆ شنرویێ، چونكە ئەمشەو بە تەواوی بۆم دەركەوت دڵیان بەیەكەوەیە.

– بە ڕاستی کچێکی شۆخوشەنگی هەڵبژاردووە، گەر هاتنەوە پێکەوە دەچین وخوازبێنی دەکەین.

– کاوەگیان ئەوان زۆر یەکتریان خۆشدەوێت، یەکتریان هەڵبژاردووە بۆ هاوسەرگیری، گەر مەرگ ڕێیدام پێکەوە دەچین، گەرنا، ئەمە ڕاسپاردەیەکەو تۆ دەبێت پێیهەستیت.

–دڵنیابە، بە هیوام تەندروستیت باشبێت، خەمی هیچ بۆ مەخۆ، کاڵێ بۆ شنروێ دەبێت.

– بۆیە پەلەمە، نەك مێردەزمەیەك لێیان پەیدا بێت وەك من و(ڕاز) یان لێبێت.با زیاتر کاتت نەگرم، سلاّوم بگەیەنە، ڕاسپاردەکەت بیر نەچێت، شەوشادیان لێککرد.

هەناسەیەکی خۆشی هەڵکێشا بە پێگەیاندنی ڕاسپاردەکەی بە کاوە کە جێی دڵنیایی بڵندە.چووە ژووری نوستنی، بۆنی سێو ژوورەوەی پڕکردبوو، بەلاّم ئەمجارە تکای دەکرد ودەیگوت، (ڕاز گیان دەزانم لە ژوورەکەی، بە بۆنەکەت دەزانم، تکات لێدەکەم خۆتم لێئاشکراکە، تکایە خۆتم پێشاندە، خۆمن ساڵەهایە جگە لە وێنەی تۆ، هیچ وێنەیەك لە ئەلبوومی چاوم هەڵنەگرتووە، نەتدیووە وێنەی بوکوزاواییمان لە کاتی نابینایی وپاش نەشتەرگەرییەکەم چۆن گەورە کردوون وهەڵمواسیوون؟!بەزەییم پێبکە، چاوی دەگێڕا بە ژوورەکەدا بەو نیازەی ئێستە نە ئێستە لە شوێنێکی ژوورەکە وەك پەری دەردەکەوێ,هەر دەرنەکەوت......

بە یادی جارانەوە دەستی بۆ عودەکەی برد، بەو هیوایەی بە هۆی عودەکەوە ڕاز خۆی پێشانی بدات، ئاوازی ئەو گۆرانییانەی لێدەدایەوە کە ڕاز چەندین جار پێی دووبارەدەکردەوە، هەمیشە ئەو ئاوازانە دەبوونە زەنگێك ولە دەرگای یادەکانی دەدا، خۆی پێشان نەدا، بەڵام لەگەڵ لێدانی ئەو ئاوازە خۆشانە شنەبا وبۆنی سێو سەرسوڕان ودڵتەنگی وخەم وئازارەکانی بە جارێ ڕادەماڵی وبە تەواوی گەشدەبووەوە، پێدەچوو لەگەڵ ئاوازەکان سەما بکات، هێند شنەبا وبۆن سێوەکەی هەستپێدەکرا.ئەو شەوە هەر وا بە ئاسانی خەوی لێنەدەکەوت، بەڵام کە خەوی لێکەوت ڕازی بینی، پێیگوت بڵند گیان من لە ژوورەکەت بووم، گوێم بۆ ئاوازەکان ڕائەدێرا، زۆر پاڕامەوە تا خۆم پێشاندەمەوە، بەڵام ڕێیان پێنەدام، داوای لێبووردن دەکەم، هەرکات بۆنی سێوت کرد، بمناسەوە. ئەمجارەیان ڕاز ماڵاوایی لێکرد وتا لە پێشچاوی ونبوو دەستی بەرزکردبۆوە بە توندی ڕایدەوەشاند وەك ئەوەی بەرەو شوێنێکی دوور هەڵبفڕێ.

لە قیرە قیڕی پۆلێك قەلە ڕەش بە ئاگاهات، وایزانی هەر نێو خەوەکەیە، بەڵام هەستی ڕاگرت قڕانی قەلەڕەشەکان کپی وماتی شەوی شاری خرۆشاندبوو، لە پەنجەرەکەوە تەماشای کرد، پۆلێ قەلەڕەش بۆ ئەو شارە هاتبوون، دەیانویست دەواریان بۆ ماوەیەك لەوێ هەڵدەن ، پاشان بگوازنەوە بۆ شوێنێ دیکەی جیهان، ئەمە

پیشـەی باڵنـدە کۆچـییەکانە، زەمـین بێسـنوورە بـۆ ئـەوان، وڵاتـی ئەوان یەك وڵاتێکە ئەویش گۆی زەوییە.

قیڕەی قەلەڕەشـەکان خورپـەی بە دڵا هێنـا، دڵـەڕاوکێی تووشـکرد، حەزیکرد زوو بنوێتەوە تا ڕاز بێتەوە خەونی، پرسیاری لێبکات لە بارەی ئەم قەلەڕەشانەوە، بەڵام نەهاتەوە.

بەیانی هەستا هێشتا شنرویْ هەڵنەستابوو، تەماشای چواردەوری خـۆی کـرد، چـاوی هەڵـدەگلۆفی و دەیکـردەوە، بێسـوودبوو، تـەنیا باڵندەیـەکی قەلەڕەشـی دەبـینی، هەسـتا، وەك نابیناکـەی جـاران هەنگاوی نا بەرەو لای ئاوێنەکە، دەستی بە چوارچێوەی ئاوێنەکـە دەهێنـا، چـاوی تـەواو دەکـردەوە، بـەڵام لـە تـاریکی زیـاتر هیچـی دیکەی نەدەبینی، گوتی ڕازەکەم فریام بکەوە لە کوێی؟! چاوەڕوان بوو، بۆنی دەکرد، ئاخۆ کەی بۆنی سێوەکە دێت، بەڵام نـەهات.

سەریسـوڕی خـوارد، سـوڕخواردنەکە بـە تینبـوو، لەگەڵیـدا بەربووەوە، (شنرویْ)ی بە ئاگا هێنا وخۆی گەیانـدە بـاوکی، پـاش پشکنینی شەکرەکەی بۆی دەرکەوت شەکرەکەی بەرز نەبووەتـەوە، بۆ دڵنیایی، پێوەندیی بە دکتۆرێکی چاوی هاوڕێوەی کرد.

دوای پشکنین، بێئومێدی لە چاوەکانیا بەدیکراو ئەو تاقە چاوەی بۆ بیستوپێنج ساڵ دەچوو، دونیای تـاریکی بۆ ڕووناك کردبۆوە، ئـەوڕۆ لەکارکـەوت، بـۆ دڵنیـابوون، دکتـۆری هـاوڕێی داوای ئەمبولانسی کرد وچوونە بیمارستانی تایبەت بە چاو، پـاش بیـنین وپشـکنینی لـە لایـەن باشـترین پسـپۆڕ لـە بـواری چـاو و مێشـك،

دەرکەوت، چاوی چاکبوونی نییەو ناشتوانرێ چاوی دیکەی بۆ بڕوێنرێ، (سەبارەت بە مێشکی لە جاران خراپترە، جۆرە نەخۆشییەکی تایبەتە بە مێشکەوە، کەم کەس تووشی دەبێت، چارەسەری بۆ ماوەی سێ مانگ پێدان، پاش تەواوبوونی ئەو ماوەیە پشکنینی بۆ دەکەنەوە، گەر باشترنەبوو، ناچاردەبن نەشتەرگەریی بۆ مێشکی ئەنجامبدەن). جگە لەو چارەسەرە دکتۆر پێیگوت بۆ گەشتکردن بیبە، کوێی پێخۆشە دڵی مەشکێنە، پێویست بە ڕێنمایی کردنی زیاتر ناکات، چونکە خۆتیش پسپۆڕی لە بواری دەروونی. زۆر خەمی لە باوکی دەخوارد، بەلاّم بەرانبەری باوکی خۆی وا پێشان نەئەدا.

شنروێ بە باوکی گوت، کوێت پێخۆشە گەشتی بۆ بکەین؟

– بێ بیرکردنەوە باوکی گوتی حەزدەکەم بچمەوە کوردستان، بۆ ولاّتەکەی خۆم، بەلاّم پێش ئەم گەشتە دەمەوێ سەردانی بەردی پیرۆز، واتە(بێچووی چیای بەفرین) بکەین.

– زۆر بە هێمنی وتی ئەی باوکە ماوەیەك لەمەوبەر نەچووین، ڕووت کردە بەردی پیرۆز وپێتگوت(زیاتر نایەم بۆ لات ، چونکە چەندێ دێم، باسی بەسەرهاتی خۆمت بۆ دەکەم هەر دەگریت، کپ وبێدەنگ لاتەوە دەوەستم هەر بۆم دەگریت، زیاتر خۆمت پێشان نادەم، چونکە زۆر بچووك بوویتەتەوە).

بڵنـــد بـــه دەنگێكـــی لەرزۆكـــەوە، گـــوتی كوڕەكـــەم، دەمـــەوێ دوا ماڵاوایی لێبكەم.(دەنگێكی غەیبی پێیدەگوت، دەگەڕێیتەوە بۆ لای ڕاز، ڕاز بە تەنیایەو چاوەڕوانی تۆیە).

لە شەودا بوو چوون بۆ ماڵاواییكردن، بە گۆچانەكەی جارانیەوە كە وەك یادگارێ لە كەنتۆری یادگارەكان هەڵیگرتبوو و هیچ كات بیری لەوە نەدەكردەوە، ڕۆژێك دێت وپێویستی پێدەبێتەوە.

ســەرەتا ، هــێمن، بەرانبــەر بــەردی پــیرۆز وەســتا، بــەڵام كڵپــەی گریـانێكی پــەنگخواردوو ئەو بێدەنگییــەی كۆتـا پێهێنـا، بـەردی پیرۆزی نەبینیبوو چۆن دەتاوێتەوە، پاشان هێور بووەوە وگوتی، ئەی بەردی پیرۆز ئەی بێچووی چیای بەفرین، خۆم هیچت لێداوا ناكەم بەڵام دەمەوێ لە یەزدان بپاڕێیتەوە، شنروێ بپارێزی، لە هەموو بەڵایەك بیپارێزیێ.

(گیانی پاكی بەردی پیرۆز دەبووە هەڵم وبەرزدەبووەوە).

شـنروێ : باوكـە بـەردی پـیرۆز بـووە هـەڵمێكی سـپی، زۆر سـپی، بـەرەو ئاسمـان بەرزدەبێتـەوە، دوو دۆڵفینـە سـپییەكە لەوسـاتەدا خۆیـان گەیانــد، وەك مــرۆڤ هاواریـان بــوو، شـەپۆلەكانی دەریـا هێنـدەی دیكـە شـێتگیر ببـوون، لەگـەڵ خۆیـان دوو دۆڵفینەكـەیان زیاتر بەرز دەكردەوە، تا ماچی گیانی پاكی بەردی پیرۆزی برایـان بكـەن، ڕوونـاكی لـە گیـانی بـەردی پـیرۆزەوە دەردەچوو، شـنروێ گـوتی باوكـە تەماشـای ئاسمـان بكـە، چـراخانە وبـەردی پـیرۆز دونیای هەموو ڕووناككردووەتەوە.

- کوڕەکەم دەبینم، زۆر جوان بەردی پیرۆز دەبینم، بە سالاچوویەکی سپیپۆش، ئەو بە سالاچووەی لە خەونمدا بینیم، خۆیەتی، کوڕەکەم خۆیەتی، ئەوە گیانی پاکی بەردی پیرۆزە، وا دەمبینێ وسلاوم بۆ دەکات، تا چاو بڕیکات تەماشای ئاسمانیان کرد، ڕووناکی کەمدەبووەوە، ئەمیش وردە وردە پێشچاوی، تاریکی جاران داپۆشییەوە.

دەریا ئارامبووەوە، دەنگی شەپۆلەکانیشی نەدەهات، وەك لە دوا مالاوایی بێچووی چیای بەفرین، لە پرسەدا بە کپوبێدەنگی وەستابن وبە ئارامی فرمێسك بڕێژن، بەلام پەرۆشی دوو دۆلفینی برا دەنگی دایەوەو تا دوورکەوتنەوە هەر شین و گریانیان بوو.

پاش سێ ڕۆژ خۆیان ئامادەکرد وهاوڕێکانیان بەڕێیانکردن، بلند هەرکەسی دەبینی داوای گەردن ئازایی لێدەکرد، تەنانەت پێوەندی بە ئالان ونیانەوە کرد کە چەندین سالبوو هەندەرانیان جێهێشت بوو.پێش دەرچوونیان، شنروێ بە دایکی چرۆ وباوە کاوەی گوت، لە فڕۆکەخانە چاوەڕوانیانبن.

شنروێ باری تەندروستی باوکی پێباش نەبوو، زۆر هەستی لای نەخۆشییەکەی باوکی بوو.

لە فڕۆکەخانە بەرزبوونەوە، ئازاری سەری زیادیکرد، تا دەهات زیاتر دەبوو، ئەو دەرزییانەی بۆ چارەسەری باوکی هەمیشە لە گیرفانی خۆی دانابوو، بە پەلە یەکیانی ئامادەکرد ولێیدا، سەری خستە سەر سینگی شنروێ، فڕۆکەکە لەنگەری خۆی گرت، ئەم

کەمێ ئازارەکانی یەخەیان بەردا، لە ئاسمانی ئەو وڵاتە هێشتا مابوون، بە نێو هەوری ئاسماندا مەلەیان دەکرد، تەماشای کرد گوتی باوکە وردە وردە دەریا دەبێت بە ڕووبارێکی خنجیلەی جوان.

- کوڕەکەم خۆزگەم بەو ڕۆژانەی بەرەو کەناری دەریا دەچووم و بەردی پیرۆز ببووە خۆشەویسترین شتێك لام، ببووە ئاوێنەی ژیانم، خۆم وکەسەکانم تێدا دەبینی، جارێکی دیکە وێنەی بەردی پیرۆز لە جیهان دروست نابێتەوە..نابێتەوە. بە دەنگی یەکێ بە گریانەوە بدوێ گوتی، کارەساتی شارەکەمی پێڕادەگەیانم، چاوی نابینام بۆ ئەوساتە دەبوونەوە، هێند پیرۆزبوو!!

حەزی نەکرد باوکی زیاتر خۆی بە ڕابردووەوە ئازاربدات، گوتی باوکە بچینەوەماڵەکەی خۆمان یان لە ماڵی باوە کاوە بمێنینەوە؟

- چۆنت پێباشە با وابێ.

- باوکە ئێستە چۆنی؟

- زۆر باشم بە تایبەت کە ڕوو لە نیشتمان دەبمەوە.

پاش چەند کاتژمێرێ لە بڵندگۆوە پێیان ڕاگەیاندن، لە ئاسمانی کوردستانن، چاوەکان گۆڕان، هەناسە هەڵکێشان بۆ باوەشی گەرمی نیشتمان، داکەندنی پاڵتۆی غوربەتی، لەشی سووککردن، هەموو تەماشای دەرەوەی دەکرد، وێنەیان دەگرت، لەو کاتە بڵند ئازاری دەچەشت بەرگەی ئەو خۆشییەی نەدەگرت، ئازارێکی زۆر تینی بۆ هێنا، دیسانەوە بۆ خەریککردنی باوکی، تەماشایەکی

دەرەوەی کرد، هەورێکی زۆر سەرنج ڕاکێشی بینی ودەستی دایە کامێراکەی و وێنەی هەورەکەی گرت وگوتی باوکە گیان وێنەی هەورێکی زۆر جوانم گرتووە، هەورێکی سەرنج ڕاکێش، لە وێنەی مرۆڤێکی پاڵکەوتوو، ڕیشی سپی ئاوریشمی، تا بڵێی مرۆڤێکی بە ساڵاچووی بە ویقارو پاکوخاوێن، بزەیەکی زۆر جوان ڕووی گەشی گرتووە. لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەی کەمێ هۆشی هاتەوە وگوتی خۆزگە دەمبینی، ئەوە ڕۆحی پاکی بەردی پیرۆزە، تەماشای کوێوە بکەم، گەرچی نابینم، بەڵام هەر حەزدەکەم ئەو بمبینێ.ڕووی لەو ئاستەکرد، لە پڕ چاوی کرایەوە، بزەی بە ساڵاچووی بینییەوە، پاش تێپەڕبوونیان و ونبوونی، چاوی، تاریکی دایپۆشییەوە.

زۆری پێنەچوو، گەیشتنە ئاسمانی سەر فڕۆکەخانەی نیودەوڵەتی، لە نیشتنەوە بوون، بڵند تەندروستی زۆر خراپ بوو، وڕینەی دەکرد ودەیگوت (بەردی پیرۆز، خۆشحاڵبووم بە بینینت، تۆش گەردنم ئازابکە، ڕۆژێ لە ڕۆژان دڵم ئازاردابیت بە بینینی کارەساتی دڵتەزێنی شارەکەم، ئازاری کارەساتی ئێمە تۆی توانەوە تۆی کردە هەڵم وهەور ولە زەوی هەڵیکەندی !!).

لە کاتی نیشتنەوە، هۆشی لای خۆی نەما، دکتۆر شنرویێ، گوتی باوکە گیان، بۆ وا دەکەیت، نەیدەزانی بووراوەتەوە یا گیانی لە دەستداوە، سەری لەسەر سینگی خۆی دانا، دەستی بۆ لای دڵی برد دڵنیابوو باوکی بووراوەتەوە.چرۆ وکاوە لە چاوەڕوانیدا بوون،

بەلاّم چیی ببینن، ( ڕاکشان وبێهۆشی بلّند لەسەر گالیسکە، یا ڕەنگ زەردی وشێواوی دکتۆر شنروێ).
کەمێ بە هۆش خۆی هاتەوە، هاواری بۆ شنروێ کرد، کاوە ماچی دەکرد وچرۆ لە پێ شێلانی دەستی هەلّگرت وبە پەلە دەستی ماچکرد، ئەویش فرمێسك بە چاوە پووکاوەکانییەوە هاتە خوارێ و گوتی، دلّم ئۆخەی کرد کە بە ئێوە شاد بوومەوە، کاوە گیان چرۆ گیان گەردنم ئازاکەن، گەر مردم دەبێ زۆر ئاگاداری شنروێ بن.
– باوکە ئێرە خەستەخانەیە، قوربانت بم باوکە قسەی وا مەکە. تێکچوونەکەت هی نێو فڕۆکەکە بوو.
– دەکەواتە بمگەیەننەوە شارەکەم، شارە پیرۆزەکەم، دەرزییە تایبەتەکەم لێدەو با بڕۆین.
لە پێشەوە دایاننیشاند، چرۆ وشنروێ لە دواوە دانیشتن، دەستیان لە نێو دەستی یەکدی نابوو، جاروبار دەستی دایکی ماچدەکرد، ئەویش دوو سێ ماچی توندی دەکرد ودەیگوت من بە قوربانت بم، خەم مەخۆ باوکت ئێستە زۆر باشە.
کاوە : بلّند ئاگات لێیانە خۆیان لە باوەش یەکدی ناوە، لێکنابنەوە.
– ئەم جارە بە وشەی بێنووزە وبە هێزەوە گوتی خوا لێکیان نەکات، شنروێ بڕیاریداوە، کلینیك بکاتەوە، ئەمجارە دایکی چرۆی جێنەهێلّێ.

چرۆ :هەرخۆم خزمەتی کلینیکەکەی دەکەم، قوربانی خۆی وکلینیکی بم.
بێدەنگی باڵی کێشابووە نێو ئۆتۆمبیلەکە، شنەبایەك بارگاوی بە بۆنی سێو، هێدی هێدی نێو ئۆتۆمبیلەکەی داگیرکرد، قژە خاوەکەی شنرویٚ ی بە ئاستەم دەجولاٚندەوە، تەزووی بە جەستەی شنرویٚ دا هێنا، تێگەیشت دایە ڕازی لێوە نزیکە.چرۆی هێنایە قسە و گوتی بۆنی سێوێکی زۆرخۆش دێت، پێدەچیٚ لەم باخانەوە بێت.
کاوە : بۆنیٚ خۆشە، بەلاٚم لێرە هیچ باخێکی سێوی لیٚ نییە.
شنرویٚ :لە باوکم بپرسن..
بڵند :کاوە گیان قوربانتبم، ڕاسپاردەکەت لە بیر نەچێت، ئێستە لای خۆت بوەستە کاوە گیان، لای خۆت.
وەستا وکاوە گوتی فەرموون با دابەزین.
پرخەیەکی لێوە هات، وەك یەکیٚ چووبێتە نێو قولاٚیی خەوەوە.
شنرویٚ لەگەڵیدا دڵی خورپەیەکی کرد گوتی باوکە گیان دابەزە باوکە دەنگی نەبوو.
کاوە بە پەلە ئاوڕی لێدایەوە، کاك بڵند، بڵند گیان، ئێستە قسەمان دەکرد.وەلاٚمی هیچیانی نەدایەوە ، چونکە (لەگەلٚ ڕازدا پێکەوە دابوویان لە شەقەی باڵ وهەڵفڕین).
بەپەلە شنرویٚ دابەزی، دەرگای لای باوکی کردەوە، گەر باوەشی بۆ نەکردبایەوە دەکەوتە سەر زەوییەکە، بۆی دەرکەوت ئەمجارە

سەرسوڕان نییە، جێهێشتن ومالآوایی تا هەتایی باوکیەتی، شنرویٚ باوەشی لە باوکی دابوو، زۆر خۆی کردە قوربانی، خەڵکی سەر ڕێگەوبان کۆبوونەوە، بە سەدەها ئۆتۆمبیل لە دوای تەرمی پیرۆزی بڵند دەڕۆیشتن.

پرسەیەکی قەرەباڵغ، پرسەیەك، بۆنی سێوی لێنەدەبڕا، چ لە پرسەی پیاوان چ لە پرسەی ژنان، ببووە نیشانەیەکی ئاشکرای پیرۆزی شەهیدان، پەرجوویی بوو، نەوە دوای نەوە باسی بکەن. مالٚی چالاك، مالٚی نیان وئالان، مالٚی کەسوکاری ئارام بێبەش نەبوون لە بەڕێوەبردنی پرسەکە وپێشاندانی هاوخەمییان بۆ مالآوایی بڵندی هەمیشە زیندوو، بۆ بڵندی باوکی دکتۆر شنرویٚ.

پاش کۆچی دوایی باوکی، بۆشاییەکی زۆر لە ژیانی دروستبوو، تەنیا مەگەر بە ئامێزی باوە کاوەو دایە چرۆی بۆشاییەکە پڕبێتەوە.لە کلینیکەکەی، کاتیٚ باشی بە نەخۆشە دەروونییەکانی شارەکەی بەسەردەبرد، (یەك ڕۆژێکی ئەو نەخۆشانەی ڕوویان لە کلینکەکەی دەکرد، هێندەی ساڵێکی دکتۆرێکی دەروونی هەندەران دەبوو) بە تایبەت ئەو شارەی تێیدا ژیانی بەسەربردبوو.ئەمەش وای کردبوو شنرویٚ بە هیچ شێوەیەك بیر لە گەڕانەوە بۆ هەندەران نەکات وڕاسپاردەکەی باوکی لە یاد نەکات، کە هەمیشە دەیوت (شارەکەم پێویستی بە ئێوەی گەنجان هەیە، بۆ خزمەتکردنی). شنرویٚ وەك نەریتێکی هەفتانە، دەچووە سەیران، دەچووە نێو ڕەز وباخەکان، دەچووە سەر گۆڕی کەسەکانی،

هەمیشــە تەماشــای کێڵــی ژوور ســەری بــاوکی دەکــرد، خــەیاڵ دەیـبردەوە، ئـەو کێڵـەی مـاچ دەکـرد، زۆر سـەرنجی دەدا، دەیگـوت (باوکم پێشانبدە، بزانم خەریکی چییە؟دەتۆش وەکو بەردی پیرۆز، دڵت بە ئازارەکانمان بسـوتێ، وەك بـەردی پیرۆز، دیمەنـەکانی ئـەو دونیامان پێشاندە، ئایا ئەوان چۆن دەژین؟!(ئایا باوکم هـەر وەکـو ئێـرە نابینایـە، وەك ئێـرە ئازارەکـانی ژیـان گرمۆڵـەی پێـدەدەن وهیواکـانی دەخنکێـنن.وەك ئێـرە بـاخ و کەسـوکاری بـە کیمیـاوی دەسوتێنن)، توخوا ببە بەردی پیرۆز و وەڵام بدەرەوە، ئاخۆ لەگـەڵ دایە ڕازم لەیەك کۆشك ژیانی تا هـەتایی بەسـەردەبەن، یا لـەوێش هـەر بـە تامـەزرۆی یـەکترەوەن. هەمیشـە بـاوکم دەیگـوت (بـەردی پیرۆز هیچ شتێك کاری تێنەکرد، تـەنیا کارەسـاتی شـارەکەی ئێمـە کاری تێکرد) دواجاری لەگـەڵ باوکم بینـیم بـە تـەواوی توایـەوە، ( بووە هەڵمێك بەرزبووەوە بۆ ئاسمان، لە ئاسمان بووە مرۆڤێکـی بـە ساڵاچوو، ڕیشـێکی سـپی ڕوخسـارێکی نـورانی، کراسـێکی سـپی سـادە هێنـدەی سـپییەتی بەفری لەبـەردابوو، پاڵکـەوتبوو، جـوانی ڕوخسـاری و بـاڵا بـەرزی، بـە تـەواوی دەرکـەوتبوو، بزەیـەکی زۆر جــوان و هەمیشــەیی بــە ڕووە نورانییەکــەوەی بــوو، دەســتی بـەرزکردبووەوە ودوا مـاڵاوایی لـە باوکم کـرد)، بـاوەڕم بـە پـیرۆزی هەموو شـتێك هەیـە، هەسـتدەکەم شـتەکانی دەوروبـەریش ڕوحیـان هەیە، دەبیستن، ئاگاداری هەموو شـتێکن، زۆر جاریش تـوڕەدەبن، (بێئاو ناژیین، بەڵام کاتێ توڕەیە هەرچیی بێتە پێشی دەیخنکێنێ،

بێئـاگر نـاژین، کـە تورەبـوو، بـەزەیی بـە کەسـدا ناکـات، چـیا پاڵپشتمانە، تورەبێ بەر تاوەری گەورەمان دەدات، درەخت وگـوڵ، دارستانی چڕ، خواردن ئامادەدەکەن، بۆن پرژێنمان دەکەن، وەك دکتۆرێـك چارەسـەری نەخۆشـەکانمان دەکـەن، سـێبەرت بـۆ دروستدەکەن، بەڵام گەر ئازاری بدەیت، خۆی وشکدەکاتەوە، گـەر گەرمییـەك بـەدی بکـات خـۆی دەسـوتێنێ، نایـەوێ سـوودت پێبگەیـەنێ، دوو بـەرد بـدەرە شـەڕا ولێکیـان بـدە، بزانـە چـۆن دەیانەوێ پریشکی ئاگرت تێگرن، تا بتسوتێنن، هیچ کات باوەش بـۆ دوژمنیـان ناکەنـەوە. ئۆتۆمبیلـەکان، تـا بـە تـەواوی پـێ لـە بیناقاقای نەنێیت وئازاری نەدەیت تەقڵەت پێلێنادات)باوکم گـوتی کەسـێك لـە مافیاکـانی شـار ویسـتی بـە چەکوشـەکەی دەسـتی، بەردی پیرۆز وردوخاشبکات، کەچی ئەو کەسـەی کـردە پەیکـەرێك ولە تەنیشتی خۆیەوە، وەك بەردی لێکرد، تا دوا تنـۆك، تـا نـەبووە هەڵم وتەواو بەرزنەبووەوە ئاسمان وازی لێنەهێنا پاشان، بە خـۆی و چەکوشەکەوەی نوقمی لیتەی کەناری دەریای کرد.دەتۆش کارێ بکـە، دەزانم ئاگـات لێمـە چـیت پێـدەڵێم، بـەڵام توخـوا بـاوکم پێشـاندە. بێسـوودبوو، پشـتی دایـە کێلەکـەوە، گریـا زۆر گریـا، هاواری بۆ بەزەیی هاتنەوە دەکرد، دەیگوت دەمـەوێ باوکم ببیـنم، جێـی بـاوکم ببیـنم، زۆری پێنەچـوو، لای ڕاستییەوە شنەبایەك لـە بۆنی سێوی هەست پێکرد، ئاوڕی چەپی دایەوە هـەمان بۆنیش لـەوێوە دەهاتـە لـووتی، دڵنیـابوو، بـاوکودایکی نـزیکن، بـە پەلـە

هەستا کێلەکەی ماچکرد، گوتی لەوڕۆوە تۆش لای من پیرۆزی، ئەو بۆنە دڵی هێورکردەوە، بە کێلەکەی گوت(ئەو بۆنە وتێگەیشتن لەو بۆنە بە باوکم بڵێ بۆتی باسبکات)، حەزی نەدەکرد بڕوات، بەڵام هێزێك هەبوو پاڵی پێوە دەنا، بڕواتەوە پشوو بدات، دەستی لە مەلەکردنی نێو ئەو بۆنە خۆشە نەدەبوەوە، ئەمجارەیان خەوێکی لە ناکاو گرتی، لە پڕ بۆن نەما، بێگومانی لە ڕووی گەشی دیاربوو کە وا لەگەڵ باوکودایکیەتی وپێیدەڵێن بڕۆوە.
بە قسەیکردن، کە دەستی لە سوکانی ئۆتۆمبیلەکەی گیربوو، خەو یەخەی بەردا، گەیشتە ماڵەوە، ئەو ماڵەی کە ڕێکەوتبوو لەگەڵ دایکی چرۆ، (هەفتەی دووشەوی تیا بخەوێ تا کاتی ژنهێنانی).
دیسانەوە خەو هێزی دەستوپێی شکاند، ناچاری کرد بە پەلە خۆی ئامادەبکات بۆ جێنووستنەکەی.بێ خەیاڵ، بێ بیرکردنەوە، بە مێشکێکی پاك وبێگەرد، تاکە شەو بوو لەوەتەی باوکی کۆچی کردبوو وا بە ئاسانی تا بەیانی بنوێ بێ ئاگابوونەوەی شەوانە.
شەش مانگ زیاتر بوو، بڵند جێیهێشتبوون، بەهار بوو، شنروێ زۆرجار لەگەڵ دایە چرۆ وکاوە ومنداڵەکان کە خوشکوبرای شیری بوون وزۆر پێوەندییان خۆشبوو، ئەوان زۆر شانازییان دەکرد کە برایانە ولە ئاستێکی بەرزدایەو دکتۆری چەندین نەخۆشی شارەکەیە، وێڕای ئەوانە، شنروێ هێندێجارحەزی بە تەنیایی دەکرد وئەوانیش ئەو خوو و نەریتەیان دەزانی هەربۆیە زۆرجار سەربەستییان پێدەدا، کاتێ بیویستایە بە تەنیا بێت.

که به تەنیا دەبوو لە دوای خۆرئاوابوون بە پێچەوانەی خەڵکەوە، ئەوان لە گەشت وسەیرانی بەهار دەگەڕانەوە، ئەم لەسەرخۆ خۆی ئامادە دەکرد، بۆ چوونە گەشت، لەو سەری شارەوە، لە سەر گردۆڵکەیەك دادەنیشت ودەیڕوانییە چواردەوری خۆی، بەڵام لەو شوێنە زۆر بۆنی دەکرد، بۆنی سێو بە لوتیا نەدەهات.

شەوێکیان، تاریکی، بە مانگەشەوە زیوینییەکە خۆی پێچا بۆوە، شنرویّ وازی لە تەماشای دیمەنی دەوروبەر هێناو ڕووی لە ئاسمان کرد، ئەستێرەکان ئەدرەوشانەوە، زۆر گەشوجوان خۆیان پێشانئەدا، زۆر سەرنجیدا، هێند نزیکبوەوە، وەکو چۆلەکەی سەرگوێسوانەکان گوێی لە جریوەیان بوو، لێیبووە شارێك، هاوسێی شارەکەی خۆی، کوچە وکۆڵانی ئەو شارەی دەکرد، وەك شارەکانی هەندەران تێیدا هەستی بە غوربەتی نەدەکرد، بە کۆڵانەکانا گوزەری دەکرد، کۆشك وتەلاری ئەو شارە، سپی وەك زنجیرە چیایەکی بەفرین وابوو، هێند سپی بوو، گوێی لە خەڵکی ئەو شارەبوو، هاوزمان، وەك ئەوان سپی پێستبوو، بەڵام بالأیان زۆر بەرزتربوو، زیرەك و وریا دیاربوون، بە نامۆیی شنروێیان زانی، چاوەڕوانی پرسیاری شنرویّ بوون، تا وەڵامی بدەنەوە، بەڵام شنرویّ حەپەسابوو، شاری وای نەبینیبوو، شارێکی ئارام، شەقامێك لە چیمەن دروستکراو، ئەمبەرو ئەوبەری چیمەنەکەش تەنیا گوڵوگوڵزار، داری بەری بێوێنە بوو، لە پشت درەختەکانەوە ڕووبارێك ئاوێکی سازگاری لە خۆگرتبوو، کەس کراسەکەی

گیرفانی نەبوو، شنەبایەکی فێنك، بارگاوی بە بۆنی ئەو گوڵانەی سەر ڕێ، ئەو بازاڕەی بۆن پرژێندەکرد، شنەبایەك هاوشێوەی ئەو شنەبایەی لەگەڵ هاتنی دایە ڕازی دەهات، واقی وڕمابوو، پرسیاری لەکەس نەدەکرد، ئاخۆ ئێرە کوێیە، ئەمە چ شارێکە، نامۆیی وغوربەتی نابەخشێ، ئەمە چ شارێکە بە شاری ڕاستەقینەی خۆتی دەزانی وتیایە بێزار نابیت، چ شارێکە ڕێز بووەتە پیشەی سەرەکی ئەم شارە، بازاڕی کەسی تێدا نییە، خاوەن دوکانەکانی ئەم شارە داری بەری وگوڵە، تەماشای هەرکەسی دەکرد زۆر بەڕێزەوە دەستیان لەسەر سینگیان دائەنا وخێرهاتنیان لێدەکرد، لای ئەوان شنروێ نامۆ بوو، جلوبەرگی وەك ئەوان سادە نەبوو، دەیانچرپاندە بنگوێی یەکتری وبزەیەکیان دەکرد، کە ئەم پیاوە کراسەکەی سپی نییە وچەندین گیرفانی هەیە، جێهێشتنی ئەو شارە لای شنروێ کارێکی ئاسان نەبوو، گوتی خوایە دەمەوێ لێرە بمێنمەوە، بەڵکو باوکم ودایکم لێرە ببینمەوە، ئەوان بۆنی سێویان لێدێ، دەڕۆیی ودەیویست بگاتە ئەو شنەبایەی بۆنی سێو دەپرژێنێ، بەڵام توشی نەبوو، گوتی خوایە گیان لێرە بمهێڵەوە، دەزانم لەم شارە باوکودایکم هەر دەبینمەوە، (ئەستێرە داچۆڕانێ)، هێنایەوە شوێنی خۆی، چاوی هەر لە ئاسمان دابڕیبوو، هەستی بە لێدانی دڵی خۆی دەکرد، لەبەر خۆیەوە دەیگوت خۆزگەم بە خۆتان، ئاخۆ کەی شارەکەی ئێمە وای لێدێت؟!

ئەستێرەیەکی دیکە داچۆڕا ڕوو لە چیای شاری پیرۆز، ترسی لێنیشت، بەلاّم خۆی گرت، ئەمجارەیان دیسانەوە تیرئاسا ئەستێرەیەکی دیکە هەر هێندە نەبوو لە لووتکەی چیا بدات، (داچۆڕا)، هەورێك پەیدابوو، وردە وردە لە چیا نزیکدەبووەوە، سەرنجیدا هەمان ئەو پیاوە بە سالاّچووە بوو، کە لە نێو فڕۆکەکە وە بینی، بەردی پیرۆزی هاتەوە یاد، زانی ئەو پەڵە هەورە لە چەشنی پیاوێکی نورانییە، ( هاوڕێی باوکێتی)، هەر ئەم بوو فریای باوکی کەوت.

دڵی هێوور بووەوە، دڵەڕاوکێ و ترسی تیا نەهێشت، گوتی وا چاکە دان بە خۆما بگرم، خۆی ئامادەکرد بۆ بەرەنگاربوونەوە، تەماشای ترۆپکی چیای کرد، لەوێوە هاتە خوارێ، تا گەیشتە پێدەشتەکە، ئەمجارەیان زۆر لەسەرخۆ سەرکەوتەوە، بینی هەورەکە لە لوتکە نزیکبووەتەوە، بە تەواوی خۆی وەك پیاوێکی نورانیی بەسالاّچوو پێشاندا، دڵی هاتە لەرزین، جاروبار خۆشییەك دایدەگرت ولەرزینی دڵی نەدەهێشت، خۆشییەك، داواکەی وا دێتە دی، (دایکوباوکی دەبینێ)، هەمان داواکانی باوکی لە هەورەکە کرد، گوتی( دەزانم تۆ بەردی پیرۆزی، ئاگاداری هەموو کارەساتەکانی جیهانی، تۆ کارەساتی شارەکەی من لە کەناری دەریا هەڵیکەندی وڕوو لە شاری ئێمە ڕێتبڕی تا بگەیتە شارەکەمان، تۆ بە سۆز و بەزەییت، چۆن داواکاری باوکمت هێنایە دی، زۆرجار دیمەنەکانی شارت پێشانی باوکم دەدا، وێڕای

نابینایی بۆ ئەو ساتە چاویشت ڕووناکدەکردەوە، بە ویستی خۆی کوچەو کۆڵانی وێرانەی شارت پێشاندەدا وهاوبەشی خەمی خۆت بــە لێشــاوێ فرمێســك ڕژان دەردەبــڕی، تــا بوویتـــە هـــەورێ هەمیشەیی، مەلێکی سپی، هاوشێوەی ئێمەی مرۆڤ وهاتی تا ئێرە ببـینی، بوویتــە گــەڕۆکی جیهــان، بوویتــە فریــاگوزاری ولأتــانی لێقــەوماو، داواکــاریم جێبەجێبکــە، تکایــە بــاوکودایکم دەوێ. ) سـەری ڕێـزی دانوانـد، دەسـتی نایـە سەرسـینەی، پاشـان سـەری بـەرزکردەوە، هـەوری پـیرۆزی نـەبینی، تەماشـای چـیاکەی کـرد، ڕەش دەچووەوە، سـەرنجی تەواویدا، جاروبار چاوی بە ئاسمانا دەگێڕا، تـا هـەوری پـیرۆز ببـینێ، ڕووناکییەکی ناکاوی ناوەنـدی چـیاکە چـاوی پێکواسـتەوە، ڕۆشـنایيەکە شـاخ وپێدەشـتەکەی ڕازانـــدەوە، گـــوڵزارو دارو بـــاخی ئـــەو دەڤـــەرەی ڕەنگـــاوڕەنگ پێشـاندەدا، هـەرجاری بـە ڕەنگـێ، پەلکـە زێڕینـەی پـاش بـارانی بـەهاربوو، چـەندێ تەماشـای دەکـرد تێـر نـەدەبوو لەبـەر سـەیری. گوڵاڵـە سـوورە هـەرجاری بـە ڕەنگـێ کراسـی لـە پەلکـە زێڕینەکـە لەبەردەکرد، پێدەشت خۆی دەڕازاندەوە، هـەمان ڕووناکی کـەناری دەریای بەو پێدەشتە بەخشـی، تەماشـای نێوەنـدی چیاکەی کـرد، دەرگایـەك دەرکـەوت، دوودەری بـەرز، بێوێنـە، ڕەونـەقی دەرگاکـە هێنـد جوانبـوو، تـەنیا لـە مـرواری دەچـوو، شـەوقی دەدایـەوە، دەســـکێکی ســـووری ئـــاڵ، هێنـــدەی بـــەرزی دەرگاکـــە، دووڵای دەرگاکـەی پێکـەوە بەسـتبوو، لەسـەر کورسـییەك، کورسـییەکی

بەرزی زێڕینی دانیشتبوو، وەك مرۆڤێك، بە ویقار، مرۆڤێك لەگەڵ بینینی، شەرم دایدەگرتی، شنەبایەك بە ئاستەم، کراسە ئاوریشمییەکەی دەجووڵان، لە پەنجەی دەستی ڕاستی ئەنگوستیلەیەك دەدرەوشایەوە، ڕیشە سپییەکەی ، ڕووخساری هەردەم بە بزەی، جوانتر ونورانی تر کردبوو، تەماشای لایەوەی کرد، تەزووی بە لەشیدا هێنا، شەرم گرتی، چۆکی دەلەرزی، زمان لاڵ ببوو، نەیدەتوانی داواکارییەکە بڵێ، تەنیا چاوەکانی بە بینینی ئەو دیمەنە دەبریسکانەوە، لەگەڵ بزەی بە ساڵاچووەکە، لەرزینی چۆکی نەهێشت، دەستی بۆ ڕیشی برد، ئەنگوستیلەکە زیاتر دەدرەوشایەوە.

لە پڕ زمانی بووەوە وگوتی ئەی بەردی پیرۆز، ئەی ئەوکەسەی سۆزت بۆ شارەکەمان کردتی بە هەور، کردتی بە باڵندەیەك، بە مرۆڤێکی باڵدار، کونوکەلەبەری دونیا دەبینی، دەمەوێ باوکم ودایکم پیشاندەی.

– من بۆ داواکاری تۆ نێردراوم بۆ ئێرە، دەستی خستە سەر سینگی (بە هەمان ئەو کەسانە دەچوو کەمێ لەمەوبەر لەگەڵیان ئاشنابوو)، دەستی درێژکرد، تیشکی ئەنگوستیلەکەی لە دەسکی سووری دەرگاکەدا، هێدی هێدی دەرگاکە کرایەوە، پێدەشتێك، لە جۆرین گوڵ، جۆرین ڕەنگ، نەك ڕەنگی گوڵانی لای خۆمان، چەندین ڕەنگیتربوون، توولە ڕێیێ لە چیمەن، چیمەنێکی نەرم، شوێنی خۆی بە نێو ئەو گوڵزارانە کردبووەوە، دوو دوو قۆڵیان

لێکنابوو، بەرگی سپییان لەبەردابوو، پێیان پەتی، سپی وناسکی پێیان لە نێو سەوزی چیمەنەکە جوانتر دەردەکەوت، بەسەر چیمەنەکە دەڕۆیشتن وگفتۆگۆیان دەکرد، چەندین داری میوەی هەمەجۆر بەدی دەکرا، هەرکەسێك حەزی لێبکردایە، تەنیا تەماشایدەکرد ولقی دارەکە بە میوەکەوە دەهاتە نێو دەستی وتەنیا ئەو لێیدەکردەوە، بینی سێوێکیان کردە دوو بەشەوە، نیوەی دایە دەسگیرانەکەی، پێکەوە لەسەر کورسی دانیشتن، مێزێك ڕازاوە بە جۆرین خواردن لە پێشیانبوو، ڕووبارێکی بەدی کرد، ئاوێکی سازگاری لە خۆگرتبوو ئەو دەڤەرەی تەیدەکرد، کۆشکوتەلاری سپی وبەرز، لە کەناری ڕووبارەکە دروستکرابوو، خۆشی وا وشوێنی وا لەسەر زەوی نەبوو، دوان لە کۆشکێك بەدەرکەوتن، بە توولە ڕێیەکانەوە پیاسەیان دەکرد، تا تەواو نزیکبوونەوە لە دەرگا، بە ئاسانی نەیانی ناسییەوە، گەنج ببوونەوە، لە تەمەنێکی زۆر لاویدا بوون، بە (بزە بێوێنەکەی باوکی، لە جوانی بێوێنەی دایکی، کە هەمیشە باوکی وەسفی بۆ کردبوو) بۆی دەرکەوت، (بڵند و ڕاز)ە، دەستی بۆ بەرزکردنەوە وڕایدەوەشاند، ئەوانیش، بە زەردەخەنەوە، سڵاویان بۆ کرد، ئەسپێکی باڵدار لایان نیشتەوە، هەر دووکیان سەرکەوتن، بڵند لە پێشەوە وڕاز لە دواوە پشتی گرتبوو، لە چاوتروکانێکا لەبەردەمی بە دووری چەند مەترێ لێوەی نزیکبوون، شنەبایەك لە بۆنی سێو ئەو دەڤەرەی تەنی، شنەباکە هیچ کاردانەوەیەکی لە ناکاوی باوك

ودایکی نەهێشت وزۆر ئاسایی پرسیاری دەکرد و گوتی باوکە گیان تۆ لە من گەنجتری، باوکە چاوەکانیشت چاکبوونەتەوە، دایکە گیان زۆر لە مێژە حەزم بە بینینت بوو.

پرسیار لە سەر پرسیار لای دروست بوو، باوکی گوتی (ئێمە ئاگاداری تۆ وهەموو خەڵکی شارین، ئێمە نەمردووین، شەهید نامرێ، شاخەکانی دەوروبەری شار جێی شەهیدانە، بەهەشتی شەهیدانە، ڕوحی شەهیدان هەمیشە لێتانەوە نزیکە، دێینە خەونەکانتان، زۆرجار پۆل پۆل بە سەر ئاسمانی شاردا لەم باخ بۆ ئەو باخ لەم کانیاو بۆ ئەو کانیاو، بە یادەکانەوە دەچینەوە، چیی خەون ببینن، ڕاستەقینەیە)،

- باوکە ئێوە دەرگاتان بۆ لێداخراوە .

- ئێمە سەربەستین و دەرگاو دیوار وشاخ نابێتە بەربەست و بە ئاسانی وبە ئازادی پێیا تێپەڕدەبین.

- باوکە..دایکە، توخوا جێم مەهێڵن، بمبەن لەگەڵ خۆتان.

- کوڕەکەم وا مەڵێ، دەمانەوێ ئێوە شار خزمەتبکەن، بیڕازێننەوە، نەهێڵن ڕەز وباخەکان وشك بکەن، ئێمە دەڕۆین وهەر ئەوەندە ڕوخسەتدراوین).لە پڕ ونبوون، سەدای دەنگەکە هێشتا مابوو(شار بڕازێننەوە، خزمەتی شار بکەن).

بۆنی سێویان بە سەریا پرژان، لە چاوتروکانێکا ڕووناکی نەما، چیا ڕەش خۆی پێشاندایەوە، ڕاچڵەکینێ ڕاچڵەکی، کەوتە سەر زەوی.ترس گرتی، ئارەقێکی زۆری کرد، بە بینینی ئەو دیمەنانە،

دڵـی دەلـەرزی، لـە لایەکـەوە دڵـی خـۆی دەدایـەوە، داواکارییـەك زۆرئەستەمە بۆ کەس و بە کەس بکرێت، بۆ ئەمیانکرد.
هەسـتا تەماشـایەکی ئاسمـانی کـردەوە، زۆر لـە دوور، نزیـك ئەستێرەیەکی گەش، هەرلە ئاستی لوتکەی شاخ، هەوری پیرۆزی بینی دەگەڕایەوە بۆ شاری ئاسمان و ئەوێی جێهێشت.
بڕیاریدا بە کەس نەڵێت تەنانەت بە دایە (چرۆ)یشـی، نەوەکو بە شێت لە قەڵەمیدەن.شارە خنجیلەکەی ئاسمان ببووە جێسەرنجی شەوانەی، زۆر شەو دەچووە بەرانبەری شاخ وبە هیوای ئەوەی جارێکی دیکە ئەو شوێنە بێوێنەیە ببینێ، بەڵام بێسوودبوو، لەبری ئەوەی جارێکی دیکە دیمەنە بێوێنەکان ببینێتەوە، لە هەر چوونێکی بۆ ئەو شوێنە، بە ناچاری زوو دەگەڕایەوە، چونکە بە زوویی خەو دەیبردەوە، بە پەلە خۆی دەگەیاندەوە ماڵ وبە ئارامی وبێخەیاڵ بردنەوە دەنوست، ڕاز و بڵند دەهاتنەوە خەوی.
کلینیکی ڕازاندەوە بە شتی سروشتی، لای وێنە کێشێکی زیرەکی شار، وەسفی ئەو شوێنەی بۆ کرد کە بینیبووی، بە وردی زۆر بە وردی وجۆشوخرۆشـەوە باسـەکەی بـۆ دەکـرد، زۆرجێسـەرنجی وێنەکێشەکە بوو، تەنانەت دروستکردنی دەرگایەك لە سەر شاخی شاری پێگوتبوو، وێنـە کێش سەریسوڕما وگوتی (چەندین ساڵە وێنـە دەکێشـم، بیرۆکـەی وا جـوانم بـە خـەیاڵیش نـەبینیووە.
فڵچەکەی هەڵگرت وخاڵبەخاڵی بیرۆکەکەی پێدووبارە دەکردەوە).

ئەو تابلۆیەی لە ژووری کلینیکەکەی هەڵواسیبوو، نەخۆشەکانی دەهاتنە ژوورەوە، زۆرجار بەو دیمەنە جوانەی نێو تابلۆکە دڵی هێوردەکردنەوە، هێند بە تامەزرۆوە باسی بۆ دەکردن، بە تەواوی دەچوونە نێو دیمەنەکانی تابلۆکەوە، گەشییەك بە ڕویانەوە دیاربوو، تابلۆکە ببووە یاریدەدەری دکتۆر شنرویّ، جگە لەوەش هەر نەخۆشێکی دەروونی باسی خەونەکانی شەوانەیان دەگێڕایەوە چۆن لە شیرینی خەوا کەسە شەهیدەکانیان ڕایاندەچڵەکێنن، دکتۆر زۆر دڵخۆشدەبوو، چونکە چارەسەری ئەو نەخۆشانەی بە زوویی دەکرد، بە چەند دانیشتنێك نەخۆشەکە نەدەگەڕایەوەو چاکدەبووەوە، چونکە ئامۆژگاری و ڕێنمایەکانی بە ئاسانی پێدەگوتن، (مامۆستایەك وازی لە پیشەی مامۆستایی هێنابوو، کارێکی دیکەی دەکرد، هەر لەو ڕۆژەوەی وازی هێنابوو، شەوانە خەونی دەبینی چۆن زۆری لێدەکەن بچێتەوە پیشەی مامۆستاییەکەی، هێند دەچوونە خەونی باری دەروونی ئاڵۆزببوو، لای دکتۆر شنرویّ باسی خۆیکرد، ئەویش وتی پێویستە بچیتەوە بۆ پیشەکەت، گەر چوویتەوە خەون نابینی و وازت لێدەهێنریّ، پاشئەوەی مامۆستا ئامۆژگارییەکەی لە گویّ گرت وچووەوە بۆ پیشەکەی، کۆتایی بە ئاڵۆزی باری دەروونی هات).

هەموو نەخۆشەکانی هاوشێوەی مامۆستای بەو شێوەیە چارەسەر دەکرد، وای لێهات دکتۆر زۆر چێژی لە پیشەکەی وەردەگرت وهەمیشە دەیتوانی بێدەرمان تەنیا بە چەند دانیشتنیّ، نەخۆشە

دەروونییەکانی چارەسەر بکات.هەفتەی دوو ڕۆژی بێبەرانبەر بۆ نەخۆشە هەژارەکانی دانا.

زۆر لە مێژبوو، خەونی بە نێو شاخ و شاری ئاسمان نەدەبینی، هەستی دەکرد خوێنی ئالودەی بۆنی سێو بووە ولە مێژە لێیبڕاوە، تەنانەت بۆ هێوربوونەوەی دلی تەنیا حەزی لە میوەی سێو دەکرد، ساردکەرەوەی مال وکلینیکەکەی هیچ کات بێ سێو نەبوون، جۆرین سێوی دەهێنا، بچوایە هەر شوێنێك سێوی لێدەکڕی، زۆر دەگەڕا تا بتوانێ بۆنی ئەو سێوە بدۆزێتەوە کە لای دایکی هەبوو، پێشخواردنی سێوەکە تێر تێر بۆنی دەکرد، ئەوەندەی بە بۆنی تێر دەبوو بە خواردنی وانەبوو، بەلآم هەمیشە دەیوت ئەم بۆنە لە کوێ وبۆنی سێوی دایکم لە کوێ!!

ئێوارەیەك دوای بەڕێکردنی دوا نەخۆش، خۆی بە تەنیا مایەوە، سێوێکی بە دەستەوە، چووە بەرانبەر تابلۆکە، (وردبووەوە، زۆر سەرنجیدا، ڕچە ڕێیەکی بەرەو شاخ گرتەبەر، گەیشتە نزیکی دەرگا کراوەکە، دەست بە سینگەوە سلاوی لە بەردی پیرۆز(بەسالآچووی نورانی کرد، لەگەل سلاو دەستی ڕێزی لەسەر سینگ دانا، بێئەوەی ئەم داوای یارمەتی چوونە ژوورەوە بکات، دەستی هێمای فەرمووی چوونە ژوورەوەی لێکرد، زۆری پێحەیفبوو بە پێلاوەوە بچێتە سەر ئەو چیمەنە سەوز ونەرمە، پێلاوەکەی داکەنی، پێی خستەسەر چیمەنەکە، خۆشییەك بە جەستەیدا تێپەڕی، شنەبایەك لە تەوقی سەریەوە تابنی پێی، نەك

هەر جەستە بەڵکو بە ناخیا تێپەڕی، هەستی بە پاکبوونەوەی ناخی خۆی کرد، هەستیکرد، چ ئازار وخەم وئاڵۆزییەکانی ژیان هەیە، بەو شنە بایە نەما وباریان کرد وقورسییان لەسەرشانی نەهێشت، هەستی کرد، بە سوکی و هێمنی هەنگاو دەنێت، باڵندە ڕەنگاوڕەنگەکانی نێو ئەو گوڵوگوڵزارەی دەبینی لەم چڵی دار بۆ ئەو چڵی دار دەفڕن، خۆزگەی نەدەخواست وەك ئەوان بێت، چونکە باوەڕی زۆر بە خۆی بوو گەر بیەوێ دەتوانێ وەك ئەوان بفڕێت، تەنیا بە تەماشاکردنی هەر کەسێ، دەستیان بەسەر سینگەوە، سلاویان بۆ دەسەنەوە، زۆر چاوی گێڕا لە باوکودایکی، نەیانی بینی، بەلام کە شنەبایەك بۆنی سێوی لە خۆگرتبوو بە لووتیا هات، تا توانی هەڵیمژی، تەماشای چواردەوری خۆیکرد، دایکی ببینێ، وا دیارە نزیکن لێی بۆیە بۆنی سێو دێت، بەلام کە بە لای هەر کەسێك تێئەپەڕی بۆنی سێوێکی خۆشیان لێئەهات، (وەك ئەوەی هەر ئێستا لە گەرماو دەرچوونەو بە ئاوی سێو خۆیان شۆریووە).لەگەڵ لێدانی دەرگاکە خۆی بە پێی پەتی لە بەرانبەر تابلۆکە بینییەوە، شڵەژا، بەو شپرزەییەوەی فەرمووی کرد، دایکی چرۆ و باوە کاوەی خۆیان کرد بە ژوورا.بە پرسیاری (دکتۆر بۆ پێت پەتییە، بەرانبەر ئەو تابلۆیە وەستاوی؟!) پەشۆکا، پێلاوەکەی کردەوە پێی، لەگەڵیا بیریکردەوە چ وەلامێ بداتەوە، پاش خێرهاتن، گوتی دەمویست بچم دەسنوێژ هەڵگرم. دایکی

گـوتی، خـۆت ئامادەبکـە ئـەم ئێوارەیـە خـواردنیٚ خۆشـم بـۆ ئامادەکردووی، هەر لەماڵیش نویژەکەت بکە.

شیرزەیی پێوە دیاربوو، تا ئەو کاتە سێوەکەی هـەر لـە نێو دەست بوو پێینەزانی بوو، بە شـەرمەوە لەسـەر مێزەکـەی دانا و ئێستێك بێدەنگبوو، کاوە گوتی منیش هەندیٚ کاری خێرم پێتە.

بیٚ بیانوو هێنانەوە دکتۆر گوتی زۆر باشە، فەرموون.

ئـەو شـەوە نەیانهێشـت شـنرویٚ بڕواتـەوە بـۆ خانووەکـەی مـاڵی باوکی.لە یەکەم قسەکردنی کاوە، گوتبووی دەمەویٚ ڕاسپاردەی باوکت ئەنجامبدەم، (جگە لەو تەلەفۆنەی لەگەڵمدا لە نیوەشەودا کردبووی، چرکە ساتیٚ پێش مەرگی، ڕاسپاردەکەی پێگوتمەوە)، خەونم پێوەی بینیووە وپێدەچێت پەلەی بێت.

خۆشترین هەواڵبوو بۆ شنرویٚ بە تایبەت کە گوتی خەونم بینیووە هەر بۆیە بڕیاریاندا بە زووترین کات بچن بۆ مهاباد.

## داخوازی

ئـەوەی جێسـەرنجی هـەموویان بـوو لـە کـاتی داواکردنـی کـاڵێ، وتەیـەکی گرینگـی بـاوکی کـاڵێ بـوو، سـەرەتا وەك بروسـکەیەك جەستەی شنروێ ی تەزاند، لاڵیکردو نەیتوانی ئەوەی لە دڵیدابوو بیڵێـت، (چۆن مامـە بەڵێنت بـە کەسێکی دیکـە داوە، بێئـەوەی بـە کاڵێ بڵێیت؟!!).

چالاك بە تێکچونی هەموانی زانی، بە تایبەت ڕەنگە پەشێوەکەی شـنروێ و فرمێسـکە گەشـەکانی کـاڵێ، چـونکە هـەر لـە یەکـەم کردنەوەی قسە لە لایەن کاوەوە، چالاك وتبوی (بەڵێنم بە یەکێکی دیکە داوە، ئەو پێش ئێوە هاتووە، ناتوانم پەشیمان بمەوە، ئێوە زۆر درەنگ کەوتوون).

کـاوە وچـرۆ بـە جووتـە وتیـان چـۆن کـاری واتکـردووە، بێئـەوەی ڕاوبۆچوونی کاڵێ ی کچت وەرگری، چونکە ئەم دوانە بەڵێنیان بە یەکتراوە. چالاك گوتبووی کاڵێی کچم ڕازییە، چونکە دەزانم هەر لەیەکەم بینینی ئەو کوڕەوە، هەستم بە کاڵێ کردووە خۆشیدەوێ. (شـنروێ زۆر بـە سەرسامیەوە، واقوڕمانێکی بێوێنـەوە تەماشـای کاڵێ دەکات ودەیەوێت بڵێت ئەوەبوو بەڵێنەکەت؟!).

کاڵێ پەتی شەرم دەپچڕێنێ، بە پەلە هەڵدەستێ و دەڵێت باوکە تۆ چیی دەڵێیت؟! شتی وا نییە ونابێت!!من و شنروێ بەڵێنمانداوە (یا بۆ یەکدیبین یا بۆ گڵ، دڵنیابە هەرواشدەکەم)، بە فرمێسك ڕژانەوە بە ڕاکردن بەرەو دەرەوەی ژووری میوان دەچێت.
(چرۆ ودایکی کاڵی دەچن بە دوویدا نەوەکو شتێك لە خۆی بکات) بەڵام زۆری پێناچێت شنروێ بە پەلە هەڵدەستێ وبە ڕاکردنێك ڕادەکات، بەرەو لای کاڵێ ودایە چرۆی ودایکی کاڵێ)، زۆر ڕووی خۆشە، پێکەنین وگریانی لە خۆشیان تێکەڵبووە، ئەوانیش سەریان سوڕدەمینێ ودەڵێن ڕازی بووە؟
شنروێ دەڵێت، (مامەم چالاك وباوە کاوەم دەڵێن، با زوو بێن تا ڕاستییەکەی بزانن).هەرکە دەچنە ژوورەوە چالاك هەڵدەستێ و نێوچەوانی کاڵێ ماچدەکات ودەڵێت خۆشحاڵم بە وەفاییت تیا دەبینم وهەمیشە شانازیت پێوەدەکەم، سەرەتا نەمویست زۆر بەردەوامبم ودڵتان ئازاربدەم، بەڵام گوتم ئەزمونێکی چاکە و بۆمنیش دەردەکەوێت تا چ ڕادەیەك یەکدیان لە دڵایە.
ئێستێك بێدەنگبوون وپاشان چالاك گوتی، ئەوی ڕاستبێت یەکێکی دیکە پێش ئێوە هاتبوو، کاڵێ دیسانەوە بە سەرسوڕمانەوە تەماشای باوکی کردەوە وباوکی بە بزەیەکەوە تەماشای کاڵێ ی کرد و گوتی، کچەکەم، ئەو کەسەی هاتبوو، تۆ کوڕەکەیت زۆر خۆشدەوێت.کاڵێ دیسانەوە ویستی هەڵچێتەوە، ئەمجارەیان چالاك ڕووی کردە شنروێ وگوتی وانیە؟

دکتۆر بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی، ڕاستە، زۆریش ڕاستە.
کاڵێ بە سەرسوڕمانەوە تەماشای خۆشحاڵی گەشی ڕوخساری شنرویٚ ی کرد، (شنرویٚ زۆر هەستی بەو ئازارە ناخۆشەی کاڵێ ی خۆشەویستی کرد وگوتی تۆ گویٚ لە باوە بگرە بزانە، کیٚ هاتووە)، بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر کاڵێ ئازار نەچێژیٚ گوتی کچەکەم، ماوەیەك لەمەوبەر (کاك بڵند و ڕازخان) هێند پاکوجوان، بە جووتە، پێکەوە هاتن و هەردووکیان لە شوێنەکانی ئێوە دانیشتبوون، کاك بڵند چاوەکانی چاکببونەوەو خۆشحاڵیکردم چاوانی چاکبوونەتەوە، نەمدەزانی لە خەونمدایە وزۆر بە ڕاستمزانی، زۆر خۆشحاڵیانکردم کاتیٚ بڵند گوتی بۆ خوازبێنی کاڵێ ی کچت هاتووین و دەمانەویٚ، (کاڵێ بدەیت بە شنرویٚ).
منیش گوتم کچ کچی خۆتانە، گرینگ ئەوەیە یەکتریان خۆشبویٚ.
ئەو وتی لەسەر ئێمە ودڵنیابە زۆر یەکدیان خۆشدەویٚت.دەستم خستە نێو دەستیان، پیرۆزباییم لێکردن، ئەوان زۆر دڵخۆشبوون، لەگەڵ ماڵاواییکردن لە چاوتروکانێکدا لە پێشچاوم ونبوون.هەر لە نێو خەوەکەدا بووم بە خۆمم گوت خۆ ئەوان مردوون وکەسیان لە ژیانا نەماون.
بە ئاگاهاتم، لەسەر جێنوستنم بووم وهەر ئەو شەوە بڕیارمدا کاڵێ بە کەس نەدەم، ئەو خەونەم بۆ کەس باسنەکەم، چاوەڕوانی شنرویٚ بکەم.هەر بۆیە پڕ بە دڵ پیرۆزباییتان لێدەکەم.

کالێ هات ودەستی باوکی ماچکرد، دەگریا وفرمێسکی خۆشی دەڕژان، شنرویَ دەستی ماچکرد وپێکەوە دەستی هەموانیان ماچکرد، پاشان بە جووتە بۆ مەتبەخ چوون وشەربەت وشیرینیان بۆ هێنان، ئەو شەوەیان بە خۆشی وشادیەوە بردە سەر.
پاش مانگیَ دوای خوازبێنی، ئاهەنگێکی خنجیلەیان سازکرد وبۆنی سێویش جێسەرنجی ئامادەبووانی ئاهەنگەکە بوو، بەلاّم لای شنرویَ ئاسایی بوو، دڵخۆشتری کرد کە دایکوباوکی بەشدارن لەو ئاهەنگە.
مامۆستا کالیَ بۆ جاری دووەم لە پاش بوونی کوڕی یەکەمیان کە ناویان نابوو(بڵند)، مۆڵەتی مامۆستایی وەرگرتبوو بۆ لە دایکبوونی کچێك بە ناوی(ڕاز).

کۆتایی

کیمیاباران چەندین چاوی پوکـان ، بـەڵام نـەیتوانی چـاوی دڵـی ئاشـقان ، بپـوکێنێ ، بـەڵکو بـەتینتر وگەشاوەتری کرد.

شەوانە پێش نووسـتن، دۆڵابـە تایبەتەکـەی دەکردەوە، لەوکاتـەدا، بـە چـاوی دڵـی، تێـر تەماشای جلوبەرگـە کوردییـە تایبەتەکـەی دەکـرد، کـە چـەندین سـاڵ بـوو پاراستبووی، گیرفانـەکانی پـڕ ببـوون لـە بـۆن، گیرفـانێ بۆنی جگەرسووتاو و هەناسە ساردی دایکـێ ، ئەویدی بـۆنی ( ڕاز )ی خۆشەویسـتی لێدەهات،گیرفانێ دیکـەی بۆنی سێوی لە خۆگرتبـوو ،ئـەو بۆنـەی، مانـدوو بـوون و مەرگەسـاتی شـارەکەی دەهێنایـەوە یـاد، ئـەیکردە نێـو گێژاوی خەیاڵێکی قووڵ.